# فەرهەنگی دەنگارە

## زاراوەکانی خۆشناوەتیی





ئامادەکردنی
محمد جمال احمد تۆتمەیی



# فەرهەنگی

# دەنگارە

بریتییە لەو زاراوانەی،کە لە خۆشناوەتی بەکاردێن

ئامادەکردنی

محەمەد جەمال ئەحمەد توتمەیی





# فەرهەنگی دەنگارە

## بریتییە لەو زاراوانەی، کەلە خۆشناوەتی بەکاردێن


ئامادەکردنی: محەمەدجەمال ئەحمەد توتمەیی

بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

نەخشەسازی نــاوەوە: نووسینگەی هیوا

خــەت: نــە وزاد کۆیــی

بــــــەرگ: ئەمین موخلیس

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٦ك - ٢٠١٥

تـــیراژ: ١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٧٥٤) ی ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە







نوسینگەی تەفسیر

بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر تونێلی شێرین پالاس

Mob: +964 750 440 51 22

Tel: +964 750 818 08 66

www.tafseer-pub.com

tafseeroffice@yahoo.com

بەناوی خودای بەخشندە و میهرەبان

## لە بارەی فەرهەنگسازییەوە

کاری فەرهەنگسازی، یان نووسینەوەی فەرهەنگ، یەکێکە لە کارە ناوازەکان، لە مێژەوەیەو بە تایبەت لەم سەدەیەی ڕابردوو، گرنگی زۆری پێ درا، ئەمەش دیارە لەبەر فراوانبوونی بووارەکانی مەعریفە بوو، کە زانیارییەکان لە ملیۆنەها تێیانپەڕاند و بووارەکانی زانستی پراکتیکی دەوڵەمەندتر بوون و چەندین بابەتی دیکەش، کە لە کۆندا وەکو بابەتێکی لاوەکی سەیری دەکرا، لەم سەدەیەی پێشوو، بە هۆی زۆر کورتبوونەوەو کارکردن لە سەری، وەکو زانستێك ناسێنراو بەم هۆیەوە بووارێکی دیکەی فراوانی زانستی بە ناوی (زانستە مرۆڤایەتییەکان) سەری هەڵدا، لەم سەین و بەینە فەرهەنگیش ڕۆژ بە ڕۆژ دەبووە باسێکی پێویستتر لە جاران و ئیدی لە گەڵێ بوواری ڕۆشنبیری و ئەدەبی و زانستە جۆراوجۆرەکانی پزیشکی و دەرمانسازی و کیمیا و ئەلیکترۆن و گەردووناسی و دەروونناسی و زمان و داب و نەریت و کەلتوری میللەتان و ... هتد فەرهەنگ دانران، ئەو فەرهەنگانەش بوونە بۆگەڕاوە (مەرجەع) ێکی بەسوود بۆ خوێنەران و بە باشی لە نێو کتێبخانە گشتی و تایبەتییەکان هەڵگیران و شوێنی تایبەتیان پێ درا.

## هەندێ فەرهەنگی گرنگ

کاری فەرهەنگسازی، کە خۆی کارێکی ناوازەیە، ئەوەشی ئامادەی دەکات و دەینووسێ، هەر دەبێ ناوازەو لێهاتوو بێ، تەنانەت زۆر جاریش لە کاری تاکە کەسی دەردەچێت و دەبێتە کاری لیژنەیەکی پشۆڕ و گەورە، چونکە بە کۆبوونەوەی



کۆمەڵێك بیر و ئەقڵی دەوڵەمەند، فەرهەنگەکە دەوڵەمەندتر و بەپێزتر دەبێت و سوودی باشتری دەبێت بۆ خوێنەر، نموونەی ئەوە لە چوار کاری دیاریکراو کورتدەکەمەوە:

**یەکەمیان:** (مونجیدی لوغەو ئەعلام) ە، کە لە لایەن دەزگایەکی نێودەوڵەتی گەورەی بریتانی ئامادەکراوەو ساڵانە شتی نوێی بۆ زیاد دەکرێ و چاپی نوێی دەخرێتە بازاڕەکان.

**دووەمیان:** (ئەلمەوسوعە ئەلعەرەبییە ئەلمویەسسەرە) کە بە هەزاران سەرەباسی تیایەو لە لایەن سەدان نووسەر و زانای پسپۆڕی عەرەبییەوە نووسراوە.

**سێیەمیان:** (مەوسوعەی هەولێر) کە لەو ساڵانە ئامادەکراو بە قەڵەمی دەیان نووسەری کوردستان لە دە بەرگدا خرایە بەردەستی خوێنەران.

**چوارەمیان:** (زاراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد) ، کە لە لایەن دەستەیەکی پسپۆڕی کۆڕی زانیاری کوردەوە لە هەفتاکان، دەیان زاراوەیان نووسی و لە گۆڤارەکەی کۆڕ بڵاویان کردەوە.

## فەرهەنگی دەنگارە

ئەم فەرهەنگە لە لایەن برای بەڕێز (محەمەد جەمال توتمەیی) ئامادەکراوە.. وەکو لەسەر بەرگی نووسراوە: (بریتییە لە و زاراوانەی کە لە خۆشناوەتی بەکار دێن) .. ئەوەش لەبەر دوو هۆ گرنگی تایبەتی خۆی هەیە:

١- کۆمەلێ ناو و وشەو زاراوەی خۆشناوەتی شەرح و ڕاڤە دەکات و بۆ فەرهەنگی گەورەی زمانی نەتەوەیی کوردییان دەپارێزێت، چونکە زمان وەکو دارستان وەهایە، بەردەوام دارە کۆنەکانی لەناودەچن و لق و پۆپی نوێیان بۆ درووست دەبێت، ئیدی نەوەی نوێ دار و درەختە کۆنەکانی لە بەرچاو ون دەبێ و ئاگای لێیان نابێ، کە ڕۆژگارێك ئەوانیش هەبوون.. بە هەمان شێوە نەوەی نوێ ئاگای لەو وشەو ناو و زاراوانەش نامێنێ، کە لە وڵاتەکەی خۆی و لە شار و

ناوچەکەی خۆی، ڕۆژگارێـك زووتـر بـاوك و بـاپیرانی بـە کاریـان هێنـاوەو بـیر و ڕۆشـنبیری و داب و نـەریت و پێویسـتییەکانی ژیـانی کۆمەڵایـەتی و سیاسـی و ئەدەبی و بژێوی و کشتوکاڵ و هـەموو لایەنـەکانی دیکـەی ژیـانی خۆیانیـان پـێ مسۆگەر کردوون.

٢ـ ئەو فەرهەنگە یەکێك نووسیویەتی، لە خۆشناوەتی چاوی هەڵێناوەو بە شیر و دۆی خۆشـناوەتی گـۆش بـووەو لـەژێر سـێبەری دار چـنار و بـەڕوو و تووەکـانی خۆشناوەتی یاریکردووەو لە بناری شاخەکانی گەورەبووە لـە نێـو گونـد و کێڵگـەو سەیرانگاکانی گوێیگرتووەو ئاخاوتووە!! ئـەوەش کەواتـە نووسـەرەکەی ئاگـاداری شتەکانی ئەو ناوچەیەیەو لە ڕووی زانیارییەوە زۆری پێیە، جیـاوازە لـە کەسـێکی دیکەی ناوچەیەکی دیکە، کە بە زەوق، یان لەبەر پێویسـتی نامەیـەکی ئـەکادیمی ڕوو لە خۆشناوەتی بکـات و بـێ زانیـاری پێشـوەختە لەسـەر ناوچـەکەو زمـان و بیرکردنەوەو ئەدەبیاتییان، لە سفرەوە دەست پێ بکات، ئـەوەی بـەر گـوێی کـەوت تۆماری بکات و ئەوەشی بۆی دەرنەکەوت فەرامۆشی بکات.

## شێوازی نووسەر لەو فەرهەنگە

١- لەو فەرهەنگەدا نووسەر هاتووە بە پێی ئەلف بـای زمـانی کـوردی وشـەکانی دابەشکردووەو هەر جارەی وشەیەکی هێناوە، کە لە سنووری ئەو پیتەیـە، کـە کاری لەسەر دەکات.

٢ـ هەر جارەی وشەیەك هاتبێ، لە دوای وشـەکە ڕاڤـەو واتـای وشـەکەو بـەواری بەکارهێنانەکەی نووسراوە.. بۆ نمونە:

ـ ( (ئەپەسمێ: ئەو زاراوەیە ئێستاش زۆر بەکاردێ، لە زۆربەی گونـدەکان مـاوە، مەبەست لەو زاراوەیە ئەوەیە: کەسـێك بـە خـۆی مـەدحی خـۆی بکـات، ئـەڵێن: تەماشی بکە، لە کۆڕ و مەجلیسان بـە خـۆی خـۆی ئەپـەسمێ!! واتـە: لـە کـۆڕ و کۆبوونەوەکاندا بە خۆی مـەدحی خـۆی دەکـات، بـێ ئـەوەی شـەرم بکـات خـۆی ئەپەسمێ) ) .

## ئەو هۆکارانەی ئەو فەرهەنگە بەسوود دەکەن

١ـ ئەو فەرهەنگە هەندێ وشەو زاراوەی تیایە، دەشێ بۆ زمانی ستاندەری کوردی سوودی لێوەربگیرێ و شوێنی وشەیەکی بیانی پێ پڕبکرێتەوە، بۆ نمونە: هەتا ئێستا لە کوردستان (لەوزەتێن) وەکو ناوی یەك لە نەخۆشییەکانی قورگ بەکاردەهێنرێ، بەڵام من لەو فەرهەنگەوە بینیم، ئەوان لە خۆشناوەتی وشەی (ئاوەنێسە) لە جیاتی وشەی (لەوزەتێن) بەکاردێنن، هەروەکو نووسراوە: ( (ئاوەنێسە: وشەیەکی ڕەسەنی خۆشناوەتییە، بە واتای لەوزەتێن دێت، ئەگەر یەکێك لەوزەتێنی بێ، ئەڵێن: ئاوەنێسەی هەستاون) ) .

٢- گوندەکان و گژو گیاو فرمانەکان و کردارەکان و خووو خدەو بەرهەمە خۆماڵییەکان زۆربەی شتەکانی دیکەی خۆشناوەتی بە خوێنەر دەناسێنێ.. بۆ نمونە:

- ( (ئاژگە: گوندێکە سەر بە ناحیەی سکتان) ) .
- ( (چەپرەك: یەکێك زۆر بە ناو ساڵدا چووبێت و کاری پێنەکرێت) ) .
- ( (چەنە: دارِمانی زەوی) ) .
- ( (قەپۆز: ئەو بەرزاییەی پێشەوەی کورتانی وڵاغ، پێی دەگوترێت: قەپۆز) ) .
- ( (کسۆگ: سەگ) ) .
- ( (کۆراو: کانییە ئاوێك، کە ئاوی کەم بێت) ) .
- ( (هوولە: ئەگەر ماڵێك منداڵیان زۆر بێت، پێی دەڵێن: هوولە) ) .
- ( (هەرِمان: ئەگەر یەکێك خەوی لێنەکەوێ و خەوی بزرِێ، دەڵێ: ئەمشەو خەوم لێ هەرِماوە) ) .
- (گۆرین: واتە کەسی غائیب.. دەڵێن: وەکی کابرای گۆرین گۆتی.. واتە: کەسە غائیبەکە گۆتی) )

٣ـ ئەم کارە کارێکی خۆماڵییەو خزمەت بە کەلتوری نەتەوەیی دەکات، جیاوازە لە هەر کارێکی دیکە، کە لە دوور و نزیکەوە پەیوەندی بە بیر و کەلتور و مێژووی دوور و نزیکی کوردەوە نەبێ.

## دوا وشەم

لە کۆتاییدا دەستخۆشی گەرمم لە برای ئازیزم کاك محەمەد جەمال توتمەیی دەکەم، هیوای ئەوەی بۆ دەخوازم ئەو کارەی وەکو دامەزراوەیەك لێ بکات، بەردەوام وشەو زاراوەی نوێی بۆ زیاد بکات، بۆ ئەوەی هەموو چەند ساڵ جارێك کە چاپی دەکاتەوە، چاپە نوێیەکە زیادکراو و دەوڵەمەندتر بێت لە چاپەکەی پێشووی، چونکە کاری وا گەورە بە تەنیا جارێك کارکردن تەواو نابێ و بێگومان زۆر شتی لەبیر دەکرێت.

**د. ئیدریس عەبدوڵڵا**
**مامۆستا لە بەشی کوردی**
**کۆلێژی زمان / زانکۆی سەلاحەددین**
**٢٩ی حوزەیرانی ٢٠١٣**

# بەرایی

گەورەیی وزانایی و دانایی هەربۆ خوای گەورەیە، لەساڵەکانی هەشتای سەدەی رابردوو دەستم بەکۆکردنەوەی کەلەپووری کوردەواری کرد ، بەتایبەتی ئەم دەڤەرەی خۆشناوەتی ، چونکە کەمتر رۆشنایی خراوەتە سەر ئەم لایەنە، وەبۆیەکەم جار پێشمەرگەو نووسەر خواڵێی خۆشبێ (یوسف شەریف) م ناسی لەساڵی ١٩٨٤ ، کەماوەیەکی زۆربوو لەگوندی توتمە بوو، یوسف شەریف عادەتی وابوو لەهەر مەدریسێکدا دانیشتبایە گوێیەکانی هەڵدەخست و هەرزاراوەیەکی نامۆی ببیستایە ئەوا یەکسەر لەدەفتەرەکەیدا دەینووسی و دەیخستەوە باخەڵی ، ساڵی ١٩٨٥ خەریکی کتێبێك بوو بەناوی (نەخۆشی چەپڕەوی منداڵێنە لەناو کۆمۆنیزمدا) بۆیە رۆژێکیان پێی وتم بائەم دەفتەرە بۆتۆبێ پێم وایە تۆزیاتر سوودی لێدەبینی چونکە من ناپرژێمە سەرئەو بابەتانەخەریکی بابەتی سیاسیم ، منیش بەکۆڵێك مەمنوون و سوپاسەوە لێم وەرگرت ، هەرچەندە دەفتەرەکە دوای کارەساتەکانی کیمیاباران و ئەنفالەوە نەمتوانی سوودی زۆر لێببینم ، چونکە کەوتە ژێر خانوەکەمەوەو سووتا، بەڵام ئەو هەوڵەی یوسف شەریف بووبە هەوێنێك بۆ سەرلەنوێ دەست پێکردنەوە بەکۆکردنەوەو نووسینەوەی زاراوەکانی خۆشناوەتی ، ئەوەبوو لە بڵاوکراوەی (ئاوێر) کەمانگانە لە (بالیسان) لە ٢٠٠٦دەردەچوو، ستوونێکمان تەرخان کرد بەناوی (زاراوەکانی خۆشناوەتی) لەهەموو ژمارەکاندا چەند زاراوەیەك بڵاو دەکرایەوە، هەرجارەی نووسەرێك بڵاوی دەکردەوە ، لەکۆتاییدا هاتمە سەرئەوەی بیکەم بە فەرهەنگێك بەناوی (فەرهەنگی دەنگارە) ئەم زاراوەیە بەو چیایانە دەڵێن کەدەنگ دەدەنەوە، هیوادارم بەم کارەم توانیبێتم خزمەتێکی بچووك بە ناوچەکەم و بەتایبەتی و خۆشناوەتی بەگشتی کردبێت و لەهەڵەو بیرچوونەکانم ببوورن ، چونکە تەنها خوای گەورە بێ کەم و کوڕیە گەورەییش تەنیا هەربۆئەوە.

**محەممەد جەمال توتمەیی**

**بەهاری ٢٠١٣ / بالیسان**

## پێشکەشە بە :

★- پێشمەرگەو نووسەر خوالێی خۆشبێ (یوسف شەریف) ی جوانەمەرگ.

★- خانەوادەکەم کە زۆر لەگەڵمدا ماندوو بوون .

★- هەموو هەوادارانی زانینی زانیاری دەربارەی خۆشناوەتی.

★- نەوەی نوێ ، بۆئەوەی لەیادیان نەچێ کەباب و باپیرانیان ئەم زاراوەو وشانەیان بەکاردەهێنا.

★- هەمووئەو خوێندکارانەی کەبەنیازن لەخوێندنی باڵا توێژینەوە لەسەربواری فۆلکلۆرو فەرهەنگ و زمانی کوردی دەکەن.

## ئـ

*- **ئاخروئۆخر** : لەکۆتایی، وەکوو دەڵێن لەئاخیروئۆخری پاییزدا سەفەرم کرد.

*- **ئاخیرشەڕ** : پیرێك کەکۆتاییەکەی بەدفەڕی و نەگریسی بێت.

*- **ئاخیرەت** : ڕۆژی دوایی، ڕۆژی قیامەت.

*- **ئاخیرەمین** : دواجارە، ئەوە ئاخیرومین جارە پێت بڵێم.

*- **ئاخیری** : لەکۆتاییدا، ئاخیری رازی و بوو و هات.

*- **ئاخنین** : تێپەستنی شت لەناو گونیە.

*- **ئاوقات** : زۆر بڵێ، زیرەك و بلیمەت لە قسەکردندا، پارێزەر.

*- **ئاوزینگ** : پێش ئەوەی گیان لەلەش جیابێتەوە، واتا دوا هەناسەی پێش مردن.

*- **ئاوارێن** : وادەڵێن ، وایان ووت.

*- **ئادێم** : وادێم، والەڕێم، (ئەتووبڕۆ منیش ئادێم) .

*- **ئاهاتم** : واهاتم ، وادێم.

*- **ئاڕۆم** : وادەڕۆم، وارۆیشتم.

*- **ئانووم** : وادەنووم.

*- **ئاوەگرد** : چیایەکە کەوتۆتە دۆڵی سماقوڵی.

*- **ئاور** : گوندێکە سەربەناحیەی سکتان.

*- **ئاژگە** : گوندێکە لەدۆڵی ئارماوان سەربەناحیەی پیرمام.

*- **ئاوەنێسە** : وشەیەکی رەسەنی خۆشناوەتیە، بەواتای لەوزەتین دێت، ئەگەر یەکێك لەوزەتینی بێت ئەڵێن ئاوەنێسەی هەستاون.

*- **ئاواژی** : سەراو نخوون.

*- **ئاودز** : برینێك تەڕکرابێ و ستووربووبێ.

*- **ئاوەسوو** : بەردێك کەئاوی زۆربەسەردا هاتبێ و لووس بووبێ.



*- **ئاییسان** : پێبوونی ئاگرو بەردەوامی گڕەکەی.

*- **ئاروو** : خەیار.

*- **ئارچاغ** : سوو ك و بێئابڕوو، دەسبڕ.

*- **ئاین و ئۆین** : فێڵ و تەڵەکەبازی.

*- **ئارماوان** : گوندێکی گەورەی خۆشناوەتیە سەربە ناحیەی پیرمامە.

*- **ئاری سیرەك** : گوندێکی بچووکە لەدەشتی هەریر، نزیك سیساوەیە.

*- **ئاروێ** : لەهەندێ گوندی سەربە ناحیەی بێتواتە بەکاردێ بەواتای خەیار.

*- **ئاوێر** : ئەم زاراوەیە لەزۆر شوێن بەکاردێت ، بەلاّم هەرشوێنەو بەجۆرێك ، وەکوو لەدەشتی هەولێر ئەڵێن (هاوێر) بەلاّم لەخۆشناوەتی ئەڵێن (ئاوێر) بەواتای لەیەك جیاکردنەوەی شت ، بەتایبەتی ئاژەڵدارەکان دوایدۆشینی مەڕو ماڵات کارو بەرخ بەردەدەنە بزن و مەڕو دوای تێر خواردنی شیر لەیەکیان جیادەکەنەوە ، بەمە ئەڵێن ئاوێرکردن.

*- **ئاشاك** : حاشاك، پەرژینێك بێ لەڕووی دانیشتوان.

*- **ئاشتەبا** : کەلوپەل، شتومەك.

*- **ئاغلەب** : زۆربەی زۆری.

*- **ئاگرۆچکە** : ئاگرێکی گچکە کە منداڵ هەڵیبکات.

*- **ئاگرۆکە** : ئاگرێکی گچکە.

*- **ئاگری بن کا** : یەکێك لەژێرەوە زیانت پێبگەیەنێ.

*- **ئاگرلێبارین** : زۆر تووڕە.

*- **ئاقوبان** : دووگوندن (ئاقووبانی سەروو و خوارو) لەرۆژهەلاّتی شەقلاّوە.

*- **ئاویلکە** : جۆرێکە لەترێ ، وەکوو ترێ ی کشمیش وایە.

*- **ئاسنجاو** : قاپ و ملاّك و تەشتی لەمس دروستکراو.

*- **ئامێ** : کورتکراوەی ناوی (ئامینە) ، بانگکردنی ئامینە.

*- **ئامۆکە** : ئامینەی رەزا شیرین.

*- **ئەپەسمێ** : ئەم زاراوەیە ئێستاش زۆر بەکاردێ ، لەزۆربەی گوندەکان ماوە، مەبەست لەم زاراوەیە ئەوەیە کەسێك بەخۆی مەدحی خۆی بکات، ئەڵێن تەماشای بکە لە کۆڕو مەدریسان بەخۆی خۆی ئەپەسمێ، واتا لەکۆڕو کۆبوونەوەکاندا خۆی مەدحی خۆی دەکات، بێئەوەی شەرم بکات خۆی ئەپەسمێ.

*- **ئەسپاب** : کەلوپەل و ئامرازو شتومەك.

*- **ئەستری** : جۆرێکە لەدڕك و چقڵ.

*- **ئەستوورك** : کولێرە، لەنان گچکەترەو چەند جۆرێکی هەیە وەکوو (ئەستوورکە بەروون، ئەستوورکە بندان، ئەستوورکە ساوار، ئەستوورك بەژاژی، ئەستوورك بەپەنیر، ئەستوورکبەکونجی، ئەستوورکە شەکر...هتد) .

*- **ئەستەویر** : بزن یان مەڕ یان مانگا کەساڵێك ئاوس نەبوبێ.

*- **ئەسکو** : ملاکی گەورەی لەداردروستکراو.

*- ئەسپەرە : پارچە دارێکی کونکراوە دەخرێتە سەرووی پێمەڕە، بۆئەوەی پێی لەسەردابنێن بۆکێڵان.

*- **ئەسپێ کوژە** : پەنجەی گەورەی دەست.

*- **ئەسقێل** : ئەم وشەیە ئێستاش بەربڵاوە لەخۆشناوەتی بەکاردێت، ماناکەشی ئەوەیە کەسێك زۆر بەژن و باڵای درێژبێت ، پێ ی ئەڵێن ئەڵێ ی ئەسقێلی ، جا ئەگەر هاتوو کەسەکە درێژیەکەی لەرادەبەدەر بێت ، بێعەقڵیەکەی زۆربێت ئەوا دەڵێن دەبڕۆ ئەڵێی ئەسقێلە جووی یان ئەسقێلە درێژی، لەکوردەواریشدا ئەڵێن کەسانی زۆردرێژ عەقڵیان لەچۆکان تێناپەڕی.

*- **ئەسکوورد** : مل، سکوورد، گەردەن.

*- **ئەشتر** : شتڵ.

*- **ئەشکێرکە** : کولێرە بەئاردە ساوار، ستوورك بە ئاردە بندان.

*- **ئەشڕەفی** : جۆرێکە لەگوڵ.

❋- **ئادێ** : ئەوە هات.

❋- **ئاهاتم** : لەخۆشناوەتی (ئا) زۆربەکاردێت ، لێرەدا بەمانای واهاتم دێت.

❋- **ئاماندی بوویمە** : بەمانای ماندوو بوومە.

❋- **ئاچم** : بەواتای وادەچم.

❋- **ئارمووش** : ئاوریشم، حەریر.

❋- **ئاراسن** : چیایەکی بەناوبانگە کەوتۆتە رۆژهەڵاتی دۆڵی مەلەکان.

❋- **ئی نەخۆشم** : بەواتای نەخۆشم بۆرەگەزی نێر بەکاردێ.

❋- **ئەنەخۆشم** : بەمانای نەخۆشم ، بەڵام بۆرەگەزی مێ بەکاردێت.

❋- **ئی نەخۆشە** : بۆرەگەزی نێر بەکاردێت کە غائیب بێ.

❋- **ئەنەخۆشە** : بۆرەگەزی مێ بەکاردێتکە غائیب بێ.

❋- **ئی ماندی؟** : بۆکەسی نێر بەکاردێت کەپرسیاری لێبکەی، بەواتای ماندووی؟.

❋- **ئەماندی؟** : بۆکەسی مێ بەکاردێ کەپرسیاری لێبکەی ، بەواتای ماندووی؟.

❋- **ئەشتاق** : زاراوەیەکی ناوچەی خۆشناوەتیە، بەواتای هیچ کامێك دێت، وەکوو ئەڵێن (شەڕەکی هەند گەورە بوو ئەشتاقەك بەسەلامەتی دەرنەچوون) .

❋- **ئەددی** : ئەی چۆن؟.

❋- **ئەددی کوو** : ئەی چۆن؟.

❋- **ئەنگۆز** : گوندێکە سەربەناحیەی بێتواتە.

❋- **ئەنوزێتۆوە** : ناڵە ناڵ دەکات.

❋- **ئەزورێتۆوە** : دوای چارەسەری برین ، شوێنەکە ئەبرژێتەوە.

❋- **ئەخێورێتۆوە** : یەکێك زۆر برسی بێت ئەڵێ درم ئەخێورێتۆوە، واتا زۆربرسیە.

❋- **ئەستوورك** : کولێرە،

❋- **ئەستوورکە بندان** : کولێرە بەئاردی پیرخەنی.

❋- **ئەلعان** : لە (الان) عەرەبیەوە سەرو گوێلاکی شکێنراوەو بۆتە العان واتا ئێستا.

*- **ئەلعانیٚ کۆکە** : ئێستاکە.

*- **ئەلعانیٚ کۆکانی** : ئێستاکانی.

*- **ئەلحەملای** : الحمد لله ، سوپاس بۆخودا.

*- **ئیحتوبار** : متمکانە پێکردن، باوەڕ پێکردن، وەکوو دەڵێن (پیاوەکی بە ئیحتوبارە) .

*- **ئیحتیلام** : کاری سیکسی کردن لەخەوندا، بەمەرجێك بەیانی کەهەڵسای خۆت تەڕکردبیٚ.

*- **ئیختیدار** : توانایی لەهێزو لەشدا، وەکوو دەڵێن (پیربووم ئیختیدارم نیە) یان (هەژارم ئیختیداری کڕینی ئەو شتەم نیە) .

*- **ئێختە** : ئەسپی خەسێنراو، یان ئەسپی گون دەرهێنراو.

*- **ئیختیار** : بۆدوومانا بەکاردیٚ :

یەکەمیان واتا پیربوون.

دووەم : هەڵبژاردن، وەکوو دەڵێن لەم دووشتە کامیان ئیختیار دەکەی؟.

*- **ئیرۆن** : زنجیرە چیایەکە کەوتۆتە نێوان دۆڵی مەلەکان و دۆڵی هەرووتیان.

*- **ئیخفال** : لەخشتەبردن ، فریودان.

*- **ئیشکاوەرز** : زەوی ووشك کێڵان و تۆودان.

*- **ئیلاقە** : پەیوەندی ، وەکوو دەڵێن (ئیلاقەم پێدانیە) واتا پەیوەندیم پێوەنیە.

*- **ئەشتۆ** : وشەیەکی رەسەنی کوردیەو بەمانای (کامە) دیٚت ، وەکوو ئەڵێن (ئەشتۆمەڕ، ئەشتۆ نەوع، ئەشتۆ رەنگ..هتد) .

*- **ئەشکەفت** : ئەشکەوت.

*- **ئەشتۆڤ** : لەهەندیٚ گوند بەتایبەتی گوندەکانی سەربەناحیەی بێتواتە ئەشتۆڤ بەکاردێت ، بەهەمان واتای ئەشتۆ دێت کە بەرامبەربە وشەی (کامە) یە.

*- **ئالیك** : تێکەڵکردنی کاو جۆ ئنجا ئەیدەن بەووڵاخ بەمە ئەڵێن ئالیك.

*- **ئاوەگر** : بەکەسی زۆر پیس دەووترێت، هەروەها ئەو کەسانەی دەست لەسەگ دەدەن پێیان دەووتن ئاوەگر.

*- **ئاپراغ** : یاپراغ ، دۆلمە.

*- **ئاخوڕ** : شوێنێك لەبەردەم وولاخی بەرزە دروست دەکرێت بۆئەوەی ئالیکی تیادا پێبدەن ، شوێنەکەش لەناو تەویلەیە، بەم شوێنە ئەڵێن ئاخوڕ.

*- **ئاورینگ** : ئەم زاراوەیە ئێستاش زۆرجاربەکاردێت و بوونی ماوە ، یەکێك ئازاری لەناکاو لەلەشدا پەیدا بێت ، وەکوو برووسکەئازار وایە، ئەڵێن لەناکاو ئاورینگەکم بە لەشدا هات.

*- **ئاوکووف** : ئەم زاراوەیە پێدەچێت لەعەرەبیەوە هاتبێت، کچ و کوڕێك شیاوو لێوەشاوەی یەکتر بن ، ئەڵێن ئاوکووفی یەکن .

*- **ئەواهێ** : لەیەك جیاکردنەوەی نێرو مێ لەخۆشناوەتی لەکاتی ئاخاوتن بەرچاو دەکەوێ، ئەم وشەیە بۆژنێکی دوور بەکاردێت ، وەکوو (کامە ژن ، یان کیهە ژن؟ لەوەڵامدا ئەڵێن (ئەواهێ) .

*- **ئەوێهێ** : بەپێچەوانەوە ئەم زاراوەیە بەرامبەر بە پیاوێکی دووربەکاردێت.

*- **ئەوانێهێ** : بۆکۆمەڵێك کەسی دووربەکاردێت .

*- **ئەوی وەگۆ** : بۆ رەگەزی نێر بەکاردێت، ئەو وای ووت، بۆکەسێکی ئامادەنەبوو (غائب) بەکاردێت.

*- **ئەوێ وەگۆ** : بۆرەگەزی مێ بەکاردێت، ئەوژنە ووتی، بەهەمان شێوە کەئامادەنەبێت.

*- **ئامان** : ئەم زاراوەیە بەواتای قاپ و مەنجەڵ و مڵاکە ، جاران لەگوند ئامان لە تریان دەکران ، ئەیان ووت تریانێ ئامانان.

*- **ئامەتێ** : بۆ دەستخۆشی کردن لەکارێك کە بەرانبەرەکەت ئەنجامی بدات ، پێی دەڵێن ئامەتێ ، یان بۆکارێك کەلەجێی خۆیدابێت و بەرانبەرەکەت جێی رەزامەندی بێت ، لەهەندێ شوێن دەڵێن (هامەتێ) .

*- **ئاوسەر** : هاوتەمەن.

*- **ئاوسار** : ئەم زاراوەیە لەزۆربەی ناوچەکانی خۆشناوەتی و دەوروبەر بەکاردێت، بەواتای قەراسـتە دێـت، ئـەو زنجیرە یـان ئـەو کنـدرەی کەلـە سـەری وولاخ دەبەسترێ بەمەبەستی راکێشان و بەستنەوە.

*- **ئێکاوێ عارەبان** : جاران ئەگەر یەکێك سەفەری کردبا بۆشوێنێك ، ئەو کەسـە خۆشەویست نەبایە لەناو خەڵك ، دوای رۆیشتنی بۆ سەفەرەکە پێیـان دەووت (رەببی دەبـەر ئێکـاوێ عارەبـان کـەوی) مەبەسـتیش لـەو دووزاراوەیـە ئـەو شوێنەیە کە هەردوو رووباری دیجلەو فورات بەیەك دەگەن (شەتولعەرەب) پێـك دەهێنن، بەم شوێنەیان دەووت ئێکاوێ عارەبان.

*- **ئیغدان** : پێدەچێت ئەم وشەیە لەتورکیەوە خزابێتە نێو زاراوەکانی خۆشناوەتی ، مەبەست لە ئیغدان دۆلابی تایبەت بە قـاپ و مـلاك و مەنجەڵـە، لـەجیاتی کەوەنتەری ئێستا ، زاراوەیەکی زۆرکۆنەو ماوەیەکە بەکارنایەت.

*- **ئەستیو** : لەشێوەی بێرۆکەو خاکەناسە بەڵام بچووکترە، لـەماددەی ئاسـن یـان تەنەکە دروستکراوە، بۆدەردانی مشکی و پـەنگری نـاو سـۆبەی دارو ئـاگردان بەکاردەهات، وەبۆ گواستنەوەی پەنگرو پشکۆ لە شوێنێکەوە بۆشـوێنێکی تـر بەکاردەهات.

*- **ئۆباو** : ئەم زاراوەیە تایبەتە بە خۆشناوەتی ، بۆبانگکردنی بـاوك بـەکاردێت، بەواتای بابە یان باوکە .

*- **ئۆدێ** : ئەمەشیان بۆبانگکردنی دایك بەکاردێت، بەواتای دایە یان دایکە.

*- **ئۆتە** : بۆ شتێکی نزیك بەکاردێت، ئەوەتە.

*- **ئۆتاهێ** : بۆشتێکی دوور، ئەوەتە.

*- **ئۆتیهێ** : بۆشتێکی دوور ئەوەتە.

*- **ئۆلۆ** : ئەوە بۆ؟.

*- **ئۆممر** : بۆیەکێك بەکاردێت کەلەژنی بترسێ، دیارە کەسێك بەو ناوە زۆر لەژنی ترساوە بۆیە ئەم نازناوە بۆئەو کەسانە بەکاردێت.

*- **ئۆحە** : لێخوڕین و دەنگدانی گاو مانگا.

*- **ئەحائەح** : یان پەح ، باوەڕنەکردن بەقسەیەك وەکوو بڵێی لەو درۆیە!.

*- **ئەحمەق** : نەفام و بێ ئەقڵ.

*- **ئەشمەك** : بەواتای شتومەك یان کەلوپەل بەکاردێت .

*- **ئەستەرك** : زاراوەیەکی خۆشناوەتیەو بەتەواوی مۆرکی ئێرەی پێوەدیارە، جاران بۆدانانی کەلوپەلی خواردەمەنی و پاراستنی تەختەیەکیان لەچوار ستوندە دروست دەکرد، لەژوورێك لەژێر دیوارداویان دەنا ، هەمبانی پڕ لە دانەوێڵەیان لەسەر دادەنا، پێیان دەووت ئەستەرك.

*- **ئۆین** : ئەم وشەیە بۆدوو مەبەست بەکاردێت، یەکەم لەکاتی یاری کردن یەکێك سرەو نۆبەتی بێت دەڵێت ئۆینێ منە، دووەم یەکێك زۆر فێڵباز بێت پێی دەڵێن ئۆین باز بەواتای فێڵباز.

*- **ئەشتەبا** : ئەگەر یەکێك زیانی بەربکەوێ ، ئەڵێن ئەشتەبام دەرنەچوو ، بەواتای هیچ شتێکم دەرنەچوو هەمووی رۆیی، لەهەندێ شوێن ئەڵێن (عەشتەبا) .

*- **ئەشتەك** : بەواتای شتێك دێ، لەکاتی مەتەڵ هەڵدانەدا ئەڵێن (ئەشتەکم ) هەیە نەپێی پێوەیە نەپانی ، بەهەموو کونان ئەزانی.پارەیە.یان ئەڵێن ئەگەر کارێکم بۆبکەی ئەشتەکتە دەمێ.

*- ئاوارێ : مەبەست لەم زاراوەیە ئەوەیە ، کەسێك قسەیەك بکات ، یەکێك لەناو مەدریسەکە دەڵێ ، ئەو کەسە وادەڵێ، واتا مەبەستەکەی ئاوایە.

*- **ئاوۆکە** : مەرەگە، شلە، یان چەلاوی گۆشت.

*- **ئیوهە** : ئەوها ، ئاوا، بەم جۆرە.

*- **ئۆوەخۆدارێی؟** : یەکێك قسەبکات قسەکانی کەس تێینەگات.

*- **ئێمەنی** : پێڵاوی ژنانە ئێمەنیان پێدەگووت، پێدەچێت پێڵاوێک لەیەمەنەوە دروستکرابێت و ئەو ناوەی بەسەردا سەپێنرابێت.

*- **ئێکتەن** : یەکێك لەماڵەوە تەنیا بێت و کەس نەبێ کاری لەگەڵ بکات.

*- **ئیخی کە** : واتا بێدەنگی کە یان بیکوژە.

*- **ئۆخەی لەخۆنەکەی** : بەواتای خێرو خۆشی لەخۆت نەکەی.

# ب

*- **بانگۆرە** : ئەسپێ لەماوەی تەمەنی بەچەند قۆناغێکدا تێدەپەڕی ، وەکوو قۆناغی سەرەتای دروستبوونی کەبە رشك دەست پێدەکات ، دوای قۆناغی رشك و گەورەبوون ئەمجارە ناوی رشکی لەسەر هەڵدەگیرێ و خێرا دەبێتە بانگۆرە، بانگۆرە ئەسپێیەکی تەواوەو ئامادەیە بۆکاری پێوەدان و خەوزڕاندنی مرۆڤ ، بانگۆرە لەتەواوی ناوچە شاخاوی و گوند نشین بەکاردێ.

*- **باغەر** : بەواتای باخەڵ دێت، بەرگێکە لەدیوی ناوەوەی چۆغەرو کورتەك دروست دەکرێت بۆپاراستنی پارەو پوول.

*- **بالیسان** : گوندێکی گەورەی بەناوبانگی خۆشناوەتیە، ساڵی ۱۹۹۹بۆتە ناحیەوسەربەقەزای شەقڵاوەیە.

*- **بالوکاوە** : گوندێکی کۆن و دێرینی خۆشناوەتیەو مێژوویێکی زۆر کۆنی هەیە، کەوتۆتە خوارووی گوندی (توتمە) ی کۆن و سەربەناحیەی بالیسانە.

*- **باسرمە** : گوندێکە کەوتۆتە دەشتی هەریر، ئیستا بۆتە ناحیە.

*- **باشوورە** : گوندێکی خۆشناوەتیەو کەوتۆتە دەشتی هەریر.

*- **باولە** : لەتەنەکە دروستدەکرا، وەکوو جانتا وابوو ، بۆجلوبەرگ لەناونان بەکاردەهات.

*- **بانمار** : بەفرماڵ، هەروەها ئەگەر بەفر بەقەد بەرزی دەستێك لەسەریان بکەوێ، ئەڵێن بانمارەك کەتیە.

*- **باووبژ** : تۆزو خۆڵ.

*- **بازی** : بۆ وولاخی بەرزە بەکاردێت ، بەتایبەتی چێڵ و مانگا، کەپێستیان رەش و سپی بێت.

*- **بازند** : پشتە دەست.

❋- **باسکەدڕی** : دڕی جۆرە دڕکێکە بەهاران کارتەیەك دەردەکات ڕەنگی مەیلەو سوورە ، ئەمە باسکە دڕی پێدەڵێن، دوای ئەوەی بەرگەکەی لێدەکرێتەوە زۆربەتام و مزرە.

❋- **باڕەکە** : دوای گەورەبوونی جووجکەی مریشك ، پێش ئەوەی بگاتە قۆناغی هێلکە کردن (باڕەکە) ی پێدەڵێن، باڕەکە واتا مریشك لەتەمەنی گەنجیدا.

❋- **باراش** : گەنم کە دەبردرێتە ئاش تا دەهاڕدرێت.

❋- **باخۆش** : گەورەبوونی منداڵ، بەرزبوونی باڵای منداڵ.

❋- **بارتەقا** : هاوشان، وەکوو دەڵێن (بارتەقای من نایێی ) یان (بارتەقای ئەو نیم).

❋- **بارستایی** : ئەستووری و بەرزی و بڵندی.

❋- **بارگەتێکنان** : کەلوپەلی گەشت و سەفەر ئامادەکردن.

❋- **بارگەو بنە** : کەلوپەلی گەشت.

❋- **باری نابەم** : پێی نەوێرم ، ناتوانم هیچ بکەم بەرانبەری.

❋- **باڕەکەو** : بێچووی کەو، فەرخەکەو.

❋- **بانگرۆز** : غلۆربوونەوە لەشوێنی بەرز.

❋- **باوەگر** : یەکێك دەست بداتە سەگ باوەگری پێدەڵێن.

❋- **بارووتی** : هەندێ باڵندە وەکوو کەوو تفتیلك کاتێ کە هێلکە دەکەن ، ئەگەر مرۆڤ بچێ لەسەرهێلانە تەنها دەست بکاتە هێلکەکان ، ئەوا جارێکی تر ئەو باڵندەیە ناچێتەوە سەرهێلکەکان، بەمە دەڵێن بارووتی، واتا نەگەڕانەوە یان تۆران بۆسەر هێلانە.

❋- **بەلەك** : بەواتای ماسولکەی ران دێت.

❋- **بەرچێر** : ئەم زاراوەیە بەمانای (بەرۆك) دێت، وەکوو ئەڵێن ماست نیە بەبەرچێرتەوە دیاربێت، واتا ئەو بەشەی سەرسینگ تاکوو دەگاتە گەردن بەرچێری پێدەڵێن.

*- **باشووکە** : جۆرێکە لەهەڵۆو باز، بەڵام بچووکترە، هێندەی کۆتردەبێت، بەهۆی چاو تیژیەوە لەبەرزایی نێچیرەکەی دەبینێ.

*- **باحورە** : بەکەسانی هێڕو گێژو نەفام دەووترێت.

*- **باقۆ** : ئەم زاراوەیە زۆربەکاردێت مۆرکی خۆشناوەتی پێوەدیارە، هەنجیر پێشئەوەی پێبگات باقۆی پێدەڵێن، دوایی کاڕکی پێدەڵێن دوایی دەبێتە هەنجیری پێگەیشتوو.

*- **باو** : باوك.

*- **بەردەکوڕە** : ناوی چۆلەکەیەکە هەمیشە لەسەر بەردو لاتە شاخەکاندا دەنگی دێت، هێلانەکەشی لەقوڕ دروست دەکات لەشاخدا.

*- **بەردگەرمووکانێ** : جۆرە یاریەکی منداڵێنەی کۆنە.

*- **بەرو بوزگوڕ** : بۆکەلوپەلی کۆنەی ماڵ بەکار دێت، واتا شڕو شیتاڵ.

*- **بەرۆژە** : گوندێکی بچووکە لەنزیك (هەرتەل) سەربەناحیەی بێتواتە.

*- **بەشقێ خوای** : بەعەشقی خوای، بۆ دڵنیابوون دێت، وەکوو ئەگەر یەکێك قسەیەك بکات بەرانبەرەکەی ئەڵێت (بەشقێ خوای) واتا بەڕاستیتە؟.

*- **بەفرە شینکە** : زیپکەیەکە لە پەنجەکانی دەست و پێدێت.

*- **بەقاسیدی** : واتا زۆر تایبەت.

*- **بەکەلی هات** : بۆ ترازانی شتێك بەکاردێت، وەکوو کورتان لە وولاخی بەکەلی هات.

*- **بەیت و بالۆر** : زۆر گۆتن و زۆربەدوای شتداچوون، بێ ئەوەی سوودی هەبێت.

*- **بەوەج** : بەهێز، بەتوانا لەکارکردن.

*- **بەنەباوی** : زنجیرە چیایەکە لەنێوان دۆڵی سماقوڵی و دۆڵی هیران.

*- **بڕوکۆکەك** : کەمێك، واتا هێندێکی کەم لە شتێك.

*- **بنار** : گریانی منداڵ ، کەزۆر بگری و ژیرنەبێتەوە،

*- **بنێسانەوە** : بەواتای پووکانەوەو لاواز بوون دێت، منداڵ ئەگەر نەخۆش بێت و نەخۆشیەکەی دیارنەبێت ، ئـەڵێن (منداڵەکـەم نەخۆشـەو هەردەبنیسـێتەوە ) واتا هەربەرەو لاوازبوون و پووکانەوە دەچێت.

*- **بنەپیتۆر** : بەکەسانی زیرەك و بلیمەت و بەتواناو کارامە دەووترێت،

*- **بن بـار** : ئەو بارەیە کەلە وولاخ دەنرێت ، بەتایبەتی ئەو بارەی کەبـە ئـەو لاو ئەولای کورتاندا شۆڕدەبێتەوە.

*- **بێن** : بەواتای پشوو دێت، چەند کەسێك کەکاردەکەن و ماندوو بونـەو ئـەڵێن با بێنەکێ بدەینی ، واتا با پشوو و ئیسراحەتێك بکەین.

*- **بێن** : بەواتای خۆدزینەوە لە وتەیەك کەبیەوێ شتێك لەسەر خۆی لاببات.

*- **بیستان جـاڕ** : ئەم زاراوەیە مۆرکی خۆشناوەتی پێوەدیارە، بە زەویەکی بـەراوو فراوان دەووترێ، ئەو زەویانە ناگرێتەوە کە دێمـین و بـەراو نـین، واتـا زەویـەك گەورەبێت و بەراو بێت و چواردەوری نەمام و باخچە بێت، بیستان جاڕ بەزۆری دەکران بە تووتن، هەروەها بەزەوی خوارو خێچ ناوترێ بیسـتان جـاڕ، بـەڵکوو دەبێت زەویەکە راست و بەرین بێت.

*- **بوار** : بەهار.

*- **بوهار** : بەهار.

*- **بوارەکانی** : ئەو زاراوەیە تایبەتە بەناوچە شاخاوی و گونـد نشـینەکان ، بـەو سەرچاوە ئاویانە دەووترێت کەتەنها لەوەرزی بەهاردا ئاویان لێهەڵـدەقوڵێ کـە وەرزی هاوین داهات کانیەکە ووشك دەبێت.

*- **بوسورمان** : واتا موسلمان، کاتی خۆی کوردە جوولەکەکان بەکاریان دەهێنا.

*- بلعات : ئەم وشەیەش لەخۆشناوەتی زۆربەکاردێت، بەواتای فێڵ بازو عـەجول لەکارو کردەوەدا، وەکـوو دەڵـێن پیـاوێکی بەبلعاتـە، واتـا کەسـێکی فێـڵ و تەڵەکەبازە.

*- **بۆریشك** : بەواتای سەرخەو شكاندن ، كەسێك كەخەوی بێت سەرەتای خەولێكەوتن و ئنجا هەڵسێتەوە ئەڵێن بۆریشكی برد، یان بەپێچەوانەوە كەسێك كە خەوی لێنەكەوێ ئەڵێ (هەند نەخۆشم بۆریشكم نەبردیە) واتا خەوی لێنەكەوتووە.

*- **بۆرژان** : یەكێك زۆر خەوی بێت بۆریشك بدات.

*- **بۆڕە بۆڕ** : دەنگی چێڵ و مانگاو گا.

*- **بانگرۆز** : غلۆر بوونەوە، یەكێ لەشوێنێكی سەرەژێر غلۆر بێتەوە.

*- **بناوان** : بۆدوو مەبەست بەكاردێت :

یەكەم : جۆگە هەڵبەستن لە رووبار ، ئەو شوێنەی ئاوی لێپەنگ دەبێتەوە.

دووەم : یەكێك سەرپەرشتی خێزان بكات یان سەرپەرشتی هەتیوكردن.

*- **بەتێ** : ئەم زاراوەیە بۆمنداڵێن بەكاردێت ، هەروەها بۆكەسانی نەخۆشیش بەكاردێت دوای چاك بوونەوە، بەواتای دارەدارە دێت، منداڵێك كەتازە دەتوانێ بەپێ بڕوا ناوەناوە هەڵدەستێتە سەرپێ و بەردەبێتەوە ، پێیان دەڵێن بەتێ دەكات.

*- **بەرچایی** : خواردنی بەیانیان.

*- **بەوشە** : ئەو ئیسكەی كەوتۆتە ژێر ئەژنۆ (چۆك) بەوشەی پێدەڵێن.

*- **بنەبان** : ژووری لای پشتەوەی خانوو، واتا كۆتایی خانوو.

*- **بەلەكار** : ئەو بزنانەی كە گوێیان لوولن و پنكی قاوەییان تێدایە.

*- **بەلەپۆش** : ئەو بزنانەی گوێیان لوولن و رەنگی گوێیان سپیە،

*- **بەزان چوون** : ئەو بزن و مەڕانەی لەچیادا دەزێن، لەمێگەل دادەبڕێن.

*- **بەلەرەش** : ئەو بزنانەی گوێیان لوولن و رەنگی گوێیان رەشە.

*- **بەحەستەم** : بەئاستەم، زۆر كەم، شتێكی زۆر كەم.

*- **بەئەمەك** : بەوەفا، كاری چاكی لەبیرنەچووە، دژی سپڵەو پێنەزان.

*- **بەرەكە** : ترێ كەیەكەم جار پێدەگات ، دەنك دەنك بەڵەك دەبێت.

*- **بەرەکە** : گوندێکە سەربەقەزای شەقڵاوەیەو کەوتۆتە سەر ڕێگای گشتی (مامەجەلکە- هیزۆپ) .

*- **بەپشی** : واتا پیاوێکی لەسەرخۆو ئارام.

*- **بەدەمار** : ئازاو مێرخاس و بەغیرەت.

*- **بەڕادان** : سپاردنی کارێك بۆکردن، وەکوو دەستیَ جلکم بەرادان داوە.

*- **بەرانپیل** : ئەو پەڕۆیەی ژن لەسەر جلوبەرگ دەیپۆشی، بۆئەوەی جلوبەرگی پیس نەبیَ.

*- **بەرهاویشتن** : لەبەرچوون.بەتایبەتی بۆئاژەڵ بەکاردیَ.

*- **بەرەواژی** : بەپێچەوانەوە.وەکوو لەبەرکردنی جلوبەرگ بە پێچەوانەیی.

*- **بەربووك** : جاران ژنێك لەگەڵ بووکدا چەند ڕۆژێك لەماڵی زاوا هاوکاری بووکی دەکرد، بۆشووشتن و کاری تر، ئەوژنە بەساڵا چووبوو پێیان دەووت بەربووك.

*- **بەربەرۆچکە** : دانیشتن لەپەنا دیوارێك یان هەرشوێنێك بۆخۆگەرم کردنەوە بەرانبەر بە ڕۆژ.

*- **بەربێرایی** : هەیوان، پێشەوە ژووری خانوو بێئەوەی ئەم لاو ئەولای دیواربن.

*- **بەرتاو** : شوێنێك کەهەتاوی لێبدا.

*- **بەرای لابەلا** : کێشەیەکی لەناکاو.

*- **بەردەستێ** : جۆرێکە لەبەرد بەهۆی پارچە ئاسنێك کەلەبەردەکە دەدرا ئاگری لێپەیدا دەبێت.

*- بەرەژێر : نشێو، لای خوارەوە.لێژ، ڕووبەرەو خوار.

*- بەسترپێری : سێ ڕۆژ بەرلەئێستا.

*- **بەسترپێرار** : سێ ساڵ بەرلە ئێستا.

*- **بەشکەم** : بەڵکوو.

*- **بەشکوو** : بەڵکوو.

*- **بەکرۆکە** : دووزمان، یەکێ بیەوێ دووکەس لەیەك بکات، شەیتان.
*- **بەفرخۆرکە** : لەتەزرە بچووکترە دوای کەوتنی بەفردەبارێ، رۆدەچێتە ناوبەفرو دەیتوێنێتەوە.
*- **بەخۆژی** : کەسێك کارێك بکات و پێویستی بەخەڵك نەبێت.
*- **بەکاوەخۆ** : بەهێواشی ، بەئارامی.
*- **بۆنکرۆز** : بۆنی شتی سووتاو.
*- **بۆن گنخاو** : بۆنی دانەوێڵەی شێدارو رزیو.
*- **بۆن خۆشکە** : گیایەکی کێوی بۆن خۆشە، رەیحانە کێویلە.
*- **بژوون** : ئەم وشەیە بۆکەسانێك بەکاردێت کەدەیانەوێ کارێك بکەن، کارەکەش لەتوانای ئەواندا نەبێت ، وەك دەڵێن (بەخوا کابرایەکی بژوونی تاکوو ئەو کارەت پێبکرێ) بەواتای لێوەشانەوە دێت ، وەك بڵێی لەتۆناوەشێتەوە ئەو کارەبکەی.
*- **بڕبوون** : دابڕان و وون بوونی چەند سەرەبزنێك یان مەڕێك لە مێگەل.
*- **برێشکە** : گوڵبەرۆژەو دەنکە کودی لەسەر ساج برژاندن.
*- **بێکێڵ** : گوندێکەلە دەوروبەری بێتواتە.
*- **بێشێخ** : گەلیەکە کەوتۆتە بەرانبەر بالیسان.
*- بێمزەڕەت : لەکاتی چاك و چۆنی بەکاردێت، بەواتای بێ بەڵای؟.
*- **بێزەوەر** : پیس و پۆخڵ.
*- **بێنمەك** : سپڵە، بێوەفا، پێنەزان.
*- **برژانەوە** : برین دوای ئەوەی دەرمانی لێدەدرێ ، ئازاری زۆرە بەو ئازارە دەووترێت برژانەوە.
*- **بزوورانەوە** : منداڵێك لەگەڵ چەند منداڵێکی تر گەمەو یاری بکات ئەڵێن بزوورایتەوە، بەواتای مەشغول بوون دێت بەیاریکردن.
*- **بزۆت** : چیلکەو داری سەربەئاگر.

*- **بێتواتە** : مەرکەزی ناحیەی بێتواتەیەو ئەم شوێنە لە مێژوودا شوێنێکی گرنگی داگیرکردووەو بەهۆی ئەو پاشماوانەی کەلەم شوێنە دۆزراونەتەوە گەواهین بۆکۆنی و دێرینی بێتواتە.

*- **بێترمە** : گەڕەکێکی مەسیحی نشینە لە شەقلاوە.

*- **بێدوایی و بمرایی** : یەکێك هیچ منداڵێکی لەدوا بەجێ نەمێنێ.

*- **بێناتان** : گوندێکی گچکەیە سەربەناحیەی بێتواتەیە.

*- **بێنوێژی** : خوێن هەبوونی ژن لەکاتی حەیزدا.

*- **بێراوە** : گوندێکی گەورەی خۆشناوەتیەو سەربەناحیەی بالیسانە، چەندین گوندی تری لێبۆتەوە، وەکوو (شێرەی سەروو و خواروو، خۆران، گورگان، کەندەسۆر، کۆخان) .

*- **بێڕۆ** : گوندێکی دێرینی دۆڵی بالیسانە، کەوتۆتە نێوان هەردوو گوندی (خەتێ و توتمە) .

*- **بێ وودم** : بێخێرو بێر.یەکێك خێری بەنێوچەوانەوە نەبێ.

*- **بیریژیان** : گوندێکی خۆشناوەتیە.

*- **بستۆکە** : ئەو ئاسنەی کە دەخرێتە سەرئاگردان بۆئەوەی مەنجەڵی لەسەردابنێن.

*- **بیسمیل** : شووشتنەوە، شووشتنی شتی مردار بیسم اللە ی لەسەر دەڵێن.وەکوو (کسۆکی خۆلێدام بسمیلم کرد) .

*- **بیستۆکە** : بەواتای ماوەیەکی کەم، وەکوو دەڵێن (بیستۆکەکی دەنووم) .

*- **بنگ** : گوفەکی زبڵ، (ئەو زبرەی فڕەدە بەربنگێ) .

*- **بیژی مۆتە** : یەکێك باوکی مردبێ و نارەوەست بێ.

*- **بینخێوە** : واتا شتێکی لەسەر دانێ ، یان داپۆشە.

# پ

*- **پاپوو** : کۆتایی پێهات، نەما، ئەگەر شتێك کۆتـایی بەشـتێك هـات و نـەما بۆمندالّێن ئەمە بەکاردێت.

*- **پاتار** : ئاژەڵ و وڵسات، کۆنە پەڕۆ، رووتی بێبەرگ.

*- **پاشاپاشایانێ** : گەمەیەکی مندالّێنەیە.

*- **پاشوەملە** : باسکردنی کەسێکی نادیار، غەیبەت.

*- **پاشوەبەرە** : دوا مندالّ کەدەبێ پاشوەبەرەی پێدەڵێن.

*- **پاش وەبژار** : دوایین جار بژارکردنی شینایی.

*- **پاك لە پاك** : قەرزدانەوەو قەرزسافکردن، تۆڵەکردنەوە.

*- **پایدۆز** : ئەم وشەیە تورکیـە و خزاوەتـە نێوزمـانی کـوردی، کۆتـایی هێنـان بەکارێك.

*- **پانکردنەوە** : خۆبردنە پێش ، ماستاوکردن.

*- **پانۆك** : هەمان واتا.

*- **پاوان** : دابڕینی پارچەیەکە گەورە لە چیا کەداربەرووی تیادا بێ ، کەس ناچـێ دارەکان ببڕی، خۆبەخاوەن زانین.

*- **پێلەقـە وورگانـە** : زاراوەیـەکی کـۆنی خۆشـناوەتیەو ئێسـتاش بـەکاردێت، بەمانای ئەوەدێ ئەگەر کەسێك بەپێلەقە لەوورگی یەکێك بدات، جا ئەو کەسە باوکە یان کەسێکی ترە بۆکەسـێکی تـردەڵێن وەڵـلاّ وای لێکـرد و کوشـتی و پێلەقە وورگانەی پێکرد.

*- **پل** : بەمانای پەنجە دێت، وەکوو دەڵێن (پلە ستوور) بەمانای پەنجە گەورە.

*- **پاتەسەر** : شوێنێکە لەسەر ، بەتایبەتی پشتەوەی سەر.

*- **پارەسوو** : دەرکردنی یەکێك بەزەبری مـلان، وەکـوو دەڵـێن (بەپارەسـووانم دەرکردە دەرێ) یان (دامە بەرپارەسووان) .

*- **پارچەرە** : منداڵێك کەکەمێك گەورە بووبێ.

*- **پیرکژین** : پژمین.

*- **پێچك** : بەمانای پێ دێت.زیاتر بۆ ئاژەڵ و باڵندە بەکاردێت.

*- **پەتك** : ئەم زاراوەیە بۆدوو مەبەست بەکاردێت :

یەکەمیان : بەپارچە گوریسێك یان پارچە کندرێك دەووترێت.

دووەمیان : بەکەسێك دەووترێت کە قسەی بـێ سـوودو کـەلك بکـات ، پێیـدەڵێن قسەی پەتك پەتك مەکە ، واتای قسەی بێ مانا مەکە.

*- **پەلار** : ئەو دارە بچووکەی کە دەیگرنە مریشك و پەلەوەر.

*- **پەلار** : تانەو سەرکۆنە، تەعلیق لێدان، پلار.

*- **پەلەندەر** : پەلامار، هێش بۆکردن.

*- **پەحائەح** : وشەی سەیرمان و باوەڕنەکردن بەشتێك.

*- **پەلەهوور** : جۆرێکە لە خـواردنی کـوردەواری، وورگـی وولاخـی بـەرزە دوای پاككردنەوە وورد دەکرێت، یان بەگەنمەکوتا لێدەنرێ یان هەربەتـەنیا لێـدەنرێت و خواردنێکی بەلەزەتە.

*- **پەشتەمار** : بەواتای خاولی دێت.

*- **پەنوور** : جۆرە گیایەکە لە کوێستانەکان لـەوەرزی بـەهاردا شـین دەبـێ، ئـەم گیایە ئاژەڵ زۆر حەزی لێیەتی و لەزەتی لێدەکات.

*- **پیراندن** : زگچوون، ئیسحال بوونی ئاژەڵ.

*- **پیرە قۆتر** : بەو بارگیرو ئەسـپانە دەووترێـت کـە پیربوونـە و توانـای باریـان نەماوە.

*- **پرپینە** : لەبنەڕەتدا پلپینەیە، بەڵام لەخۆشناوەتی پرپینەی پێدەڵێن، جۆرێکە لەگیا لەهاوینان لەناو شینایدا دەڕوێ و بەبژارناوزەد دەکرێ و لەگەڵ نیسک و مزەورە لێدەنرێ و بەلەزەتە.

*- **پەمۆگشتە** : گیایەکی بەهاریە، بەرێك دەدات پەمۆگشتەی پێدەڵێن وەکوو پەمۆ نەرم و نیانەو دوای ئەوەی بەرگەکەی لەسەرلادەبەن زۆربەتام و خۆشە.

*- **پیرەباو** : ئەمەشیان بەهاران دەڕوێ دوای هەڵکەندنی بنکەکەی پاك دەکرێتەوەو شیرن و بەتامە.

*- **پۆخ** : لەوەرزی بەهاردا پێش ئەوەی دارگەڵای دەرکرد، هەموو دارێك سەرەتا بەپۆخ دەست پێدەکات، واتا سەرەتای دەرکردنی گەڵا پۆخی پێدەڵێن.

*- **پەپوولە** : جگەلەوەی بەپەپوولەی ئاسایی دەووترێت، جۆرە گیایەك بەهاران دەڕوێ پەلکەکانی دوودوو دەردەکات کەمێك پانن، گیایەکی بەتامەو بەتازی دەخورێت ، پاشانیش قەلۆکێك دەردەکات.

*- **پەڕین** : کاری سێکسی ئاژەڵ.

*- **پەرچ** : پێچدانەوەی ئاسن و بزمار.

*- **پەلەزێ** : رووەکێکی بەهاریەلەلێڕەوارەکان دەڕوێ ، گوڵێکی سێ پەلکە دەردەکات بەقەد دەستێك لەزەوی بەرز دەبێتەوە، هەرچەندە تامی زۆرخۆش نیە بەڵام گوڵەکەلێدەکرێتەوەو دەیخۆن.

*- **پەککوو** : وشەی سەیرمان، وشەی داخ و خەم، وەکوو (پەککوو لەو پیاوە باشەی کەمرد) .

*- پووچە : جگەلەوەی بەمرۆڤی لاواز دەووترێت ، بەهیچ و پووچیش دێت.

*- **پووزەکە** : یەکێك زۆر لاواز و کزبێت.

*- **پشی** : بۆدوومەبەست بەکاردێت، یەکەم بەمانای هەناسە دێت وەکوو دەڵێن (پشیم تەنگە ) واتا هەناسەم تەنگە، دووەمیان بەمانای پشوو دێت ، وەکوو دەڵێن (با پشیەکێ بدەینێ) واتا با پشووێك بدەین.

*- **پشپشۆکە** : گیایەکە لەکلکی پشیلە دەچێ.

*- **پشکە خێر** : ئەو گۆشتەی دەکرێتە خێر.

*- **پۆز** : جگەلەمانای خۆدەرخستن و دەعیەو تەکەبور دێت، بەواتای کوونی کۆمیش دێت، بەتایبەتی مندالّ بەکاری دێنن بۆجنیو بەیەکتردان.

*- **پەقۆ** : لەهەندێ گوندی خۆشناوەتی ئەم زاراوەیە بەکاردێت ، بەمانای نان و ماست، نان ووردکردن و تێکەڵکردنی لەگەڵ ماست، هەرچەندە لەگوندی هەرتەل بە گەنەکوتا دەڵێن پەقۆ، لەهەندێ شوێن لەجیاتی پەقۆ (نەرەفیل) و (نان بەچینە) و تلیت و ماست) بەکاردێنن.

*- **پەسیرە** : بەرسیلە، ترێ پێش ئەوەی پێبگات.

*- **پێپێوەنان** : زۆر بەپەلە راکردن و غاردان و هەلاّتن.

*- **پیتاك** : ئابۆنە، پارە کۆکردنەوە بۆ دەوڵەت و حیزب و لێقەوماوان.

*- **پیچەك** : کەمێك، تۆزێك، هەندێك.

*- **پێك** : ئەم زاراوەیە بەواتای ئەوەدێ کەوا منیش بکەن بە هاوبەش لەم کارە، ئەگەر چەند کەسێك کارێك بکەن یان یاریەك بکەن ، یەکێکی تر دەچێت ، داوادەکات کەوا لەم کارەیان لەم یاریە بەشداربێت و دەڵێت (پێکی منیش بکەن) واتا بمکەن بە شەریك یان هاوبەش لەم ئیشە.

*- **پۆخین** : جاران لەکۆتایی زستان و سەرەتای بەهار، پۆخینییان دروستدەکرد، پۆخین بریتی بوو لە برژاندنی گەنم و نۆك و دوایە بە دەستاڕ دەیان هاڕی و ئەو ئاردەی کە دروست دەبوو ، پۆخینیان پێدەگوت، دابەشیان دەکردو بەلەزەت و خۆش بوو.

*- **پۆش** : بزنی رەشی گوێ سپی، یان بزنی سپی گوێ رەش.

*- **پۆشتەوپەرداخ** : رێك و پێك و ئامادە.

*- **پووش و پەراش** : گیای ووشکی بابردوو.

*- **پووشکار** : زەرد بوونی گیا لەسەرەتای هاوین، پووشپەڕ.

*- **پێچەك** : دوای ئەوەی بارلە وولاخ دەنرێ بۆقایمکردنی بارەکە ، دارێکی گچکە دەهێنن ، لەو گوریسەی کەبارەکەی پێقەیکراوە ، دارەکە لەو گوریسە دەئالێنن و چەندجارێك دەیسورێنن ، بۆ ئەوەی بارەکەی پێ توندوتۆڵتر بکرێ، بەمە دەڵێن پێچەك.

*- **پێخۆر** : خواردنی بەیانیان لەگەڵ نان بیخۆی.

*- **پێتەرازوو** : سەبەتەی گچکە..

*- **پێدرێژی** : لەئەندازەی خۆ دەرچوون، وەکوو (چیدی پێدرێژیان نەکەی!) .

*- **پێگرتی** : منداڵ کەتازە بەپێ بڕوا.

*- **پێوێران** : دەرەقەت هاتن.

*- **پێهەرمیزتن** : میزبەسەردا کردن.

*- **پوونگین** : شوێنێك کە پوونگی زۆربێ، سەرچاوەیەکی ئاوە لەدۆڵی بالیسان.

*- **پونگینە** : گوندیکە لەدۆڵی هیران.

*- **پێچ** : دوو مانا دەبەخشێ، یەکەمیان : بەواتای لۆفە دێت، دووەمیان بەواتای ئازاردێت.

*- **پند** : ئەسپێی مریشك.

*- **پنج** : بنەگیا، رەگ و ریشەی گیا، وەکوو (گیالەسەر پنجی خۆی دەڕوێتەوە) .

*- **پندڕ** : لەناوچەی خۆشناوەتی سەرەتای پێگەیشتنی ترێ و کاتێك هێشوە ترێیەکان نیوەی پێگەیشتبێ و نیوەی تریشی پێنەگەیشتبێ ، ئەوا پێی دەڵێن (پندڕ) .

*- **پرکێشی** : سووربوون لەسەر شتێك، پێداگرتن لەسەر مەبەستێك.

*- **پرێسك** : بوخچە، شتی لەناو پەڕۆ پێچراو.

*- **پزدان** : بێچوودانی ئاژەڵ.

*- **پنگانەوە** : ئاو لەناو جۆگە کاتێك بەهۆی گەڵای ووشك و بەردو خۆڵەوە دەگیرێتەوەو پنگ دەخواتەوە.

# ت

*- **تات** : شوێنی نوێژکردن.

*- **تاتەشۆر** : شوێنی شووشتنی مردوو.

*- **تاتەفەلە** : یەکێك سەری زۆر گەورە بێت پێیدەڵێن (سەرتاتەفەلە) .

*- **تادار** : کەسێك تای لێبێ و نەخۆش بێ.

*- **تازیلە** : برووش.

*- **تاریشك** : گیایەکە شیری تیادیە، ئاژەڵ زۆری حەزلێدەکات .

*- **تامیسکە** : زیپکەی سەرلێو .

*- **تانج** : جۆرە گیایەکە بەهاران بنەکەی دەخورێت.

*- **تانۆك** : دیواری بەپەرژین و بەقوڕسواخ دەکرێ.

*- **تاراو** : ئەو ئاوانەن کەتاڵن، هەروەها بۆگرۆەتی قوڕەکەی بەکاردێنن.

*- **تارك** : پیسی و قرێژی تووتن و تەماتە کاتێك کاتی لێکردنەوە.

*- **تارینان** : گوندێکە لەدۆڵی مەلەکان.

*- **تارووکە** : زۆر خێراو تەنگاو.

*- **تاوی دایێ** : هێرشی بۆکرد، پەلاماری دا.

*- **تاودان** : خێرا ڕۆیشتنی ئەسپ.

*- **تاولێهاتن** : بێ ئۆقرەیی، یەکێك زۆر خێرابێ لەکاروباردا.

*- **تاوك** : جۆرە دارێکە، بەرەکەی وەکوو گێوژ وایە.

*- **تاییفە**، بەرەباب، بنەماڵە.

*- **تایێفی** : جۆرێکە لەترێ، ترێی دەنك درێژ.

*- **تفەنگچی** : دەستڕاست لە نیشانە شکێنی، دۆستی تفەنگ.
*- **تفنك** : لووت و کەپووی وولاخ.
*- **تفتیلك** : کۆترە باریکە، وەکوو کوختی وایە.
*- **تەبەقە** : نەخۆشیەکی ئاژەڵە، جاران دوای ژنهێنان خەڵکی گوند کەلوپەلی پێویستیان بۆماڵی زاوا دەبرد، هەفتیانەی ئێستا.
*- **تەپاندن** : لێدان لەمنداڵ، وەکوو (وەڵلاهی دەبی بتتەپینم) .
*- **تەپژن** : دەنگی لێدان، دەنگی بەربوونەوە.
*- **تەححائەح** : وشەی سەرسوڕمان ، یەکێك قسەیەك بکات بەرانبەرەکەی سەری سوڕدەمینێ و ئەم وشەیە بەکاردێنێ.
*- **تەترەکردن** : هەڵتەکاندنی تووتن بۆپاك بوونەوە.
*- **تەرتەشاخ** : بەپارچە شاخێکی باریك دەووترێت.
*- **تەرس** : نامووس.
*- **تەژە** : ئەو دارەی کەلە ژێر دارمێوی دادەنێن بۆئەوەی مێوەکە بچێتە سەری.
*- **تەژەندەر** : یەکێك باڵای زۆر درێژبێت .
*- **تەژگەبەر** : پارچەبەرێکی بچووك.
*- **تەڕاش** : داربەڕوو پێش ئەوەی گەورە بێت، چەند دارێکی قەد باریك لەیەك نزیکن .
*- **تەڕکەحۆل** : یەکێك باڵای زۆر درێژبێت و کەم ئەقلیش بێ.
*- **تەڕو ئیشکانێ** : جاران بۆدەستپێکردنی یاریەك یان کارێك بۆئەوەی کێ یەکەم کەس ئەو یاریە بکات یان ئەو کارە بکات، بەردێکی پانیان لایەك تەڕ دەکردو دەهەوایان هەڵدەهاویشت ، یەکێك لای تەڕی هەڵدەبژارد ئەوەی تریش لای وشکەکە، کامەلا کەوتبایە لای سەرەوە کە بەردەکە دەکەوتە خوارەوە ، ئەوا ئەو کەسە دەیبردەوە.
*- **تەقەورەقە** : شەڕوهەراو لێکدان، نیشانە شکێن، دەستڕاست .

*- **تەقەلۆ** : سووتانی شوێنێك یان كەسێك بەتەواوەتی ، واتا سووتانی تەواو.

*- **تەریس** : گونیە ، گوش.

*- **تەختەبەڕ** : بەڕەی گچكە، بەڕە.

*- **تەقەتكردن** : شاردنەوەی شتێك.

*- **تەگە** : نێری، سابرێن.

*- **تەگەگرتن** : ئاوس بوونی بزن لە نێری.

*- **تەم** تەم : گەڕەكێكە لە شەقلاوە.

*- **تەرۆك** : لایەكی وورگ، بەتایبەتی چێر پەراسووەكان تەرۆكی پێدەڵێن.

*- **تەرەس** : جنێوێك بوو ، ئێستا كەم بەكاردێت، پێدەچێت لەعەرەبیەوە دزەی كردبێت.

*- **تەریفە** : یەكێك زۆر ماندووبێت ئەڵێت تەریفە بووم، واتا زۆرماندووبووم، هەروەها بۆئەوەش دێت كەنەخۆش بێت و نەخۆشیەكەی زۆری بۆبێنێ .

*- **تەڕك** : جگەلەوەی كەبە دارێكی تەڕ دەڵێن، هەروەها بە قەدی داربەڕوەوش دەڵێن، بەتایبەتی لەوەرزی زستان دوای ئەوەی گەڵاكەی پێوەنەما.

*- **تەڕلان** : ژنی جوان و پێش چاو.

*- **تڕاندن** : فرت و فێڵ لەیەكێك كردن.

*- **ترەكین** : دێڵەسەگ (دێرەكە) كە بێچوو هەڵدێنێ.

*- **ترشۆكە** : جۆرە گیایەكی بەهاریە ترشە.

*- **تلوور** : یەكێك لەسەرزگ بكەوێ و قوونی بەرزبكاتەوە.

*- **تەس** : ئەگەرووڵاخ پێی لەسەر شتێك دابنێ ئەوا بەتەس پێیەكەی لادەبا.

*- **تەسمە یان تاسمە** : هەڵخلیسكانی ووڵاخ لەسەر بەردو شوێنی لووس.

*- **تەوسكە** : گوندێكە لەبناری سەفین ، هەروەها سەیرانگایەكی بەهاریە.

*- **تۆپین** : مردنی ئاژەڵی وەكوو كەرو سەگ....هتد.

*- **تۆقەسەر** : تەپڵی سەر.

*- **تۆڕی** : سەگی بەرەڵلاو بێ خاوەن.

*- **تورخانەوە** : توانەوە، شل بوونەوە.

*- **توورداس** : تەورداس، داسی دەست بۆبڕینی دار.

*- **توتمە** : گوندێکە لەرۆژئاوای ناحیەی بالیسان.

*- **تووک** : دوعای خراپکردن بۆکەسێك.

*- **توولەڕێ** : ڕێگەی باریك لەچیا.

*- **توولەمار** : ماری باریك و بچووك.

*- **توولەنەمام** : ڕێچکەداری باریك و ڕاست و بەرز.

*- **توناوتوون** : بەیەکجاری فەوتان و ئاسەوار نەمان، (هەی زاڵم یاخوە تونـاوتوون چی) .

*- **تکدان** : بۆمنداڵی عەجول و نارەوەست بەکاردێت، ئەڵێن (تکدانی نیـە) واتـا دانیشتنی نیە.

*- **تەنگە** : پەتێکی پانە لەمووی بزن دەپەشترا و دواتر بەرایەڵە دەکرا بەتەنگـە، دوای ئەوەی کەوا وولاخ کورتان دەکـرا، بۆبەسـتنەوەی کورتـان لـە وولاخەکـە بەژێر زگی وولاخەکە چەند جاریك دەی پێچن.

*- **ترگارە** : گوندێکە لەنزیك شەقلاوە.

*- **ترقژنی پێکەنین** : دەنگی پێکەنینی بەرز، قاقاپێکەنین.

*- **ترگێسك** : بەکەسانێك دەووترێت کە پشوو تەنگن و زوو زوو تـەنگاو دەبـن و پشوو درێژ نین و ڕاڕان.

*- **تیسکن** : کوڵکن، زۆربەموو.

*- **تیسمار** : ئەم زاراوەیەش یەکێکە لەزاراوەکانی خۆشناوەتی ، مەبەسـتیش لـە (تیسمار) پارچەیەکی بچووکە، وەکوو ئەڵێن (تیسـمارێك لـەو قوماشـە) واتـا پارچەیەکی گچکە، وەبۆ زەویـش بـەکاردێت، وەکـوو ئـەڵێن (چـی هەیـە لـە گوندتەنها تیسمارە عاردەکی هەیە) .

*- **تیشەران** : بەردەلآنی سەخت.

*- **تیشەشاخ** : شوێنی هەڵدێرو بەرزی شاخ.

*- **تیف تیفە** : خۆجوان و لووس کردن، وەکوو (واخـۆی تیـف تیفەکردیـە پیـاوی شێتەکا) .

*- **تیخ** : چەقۆ.

*- **تیخنەزەرد** : ئەو منداڵێنەی کەلاوازو رەنگ زەردن.

*- **تێتەقاندن** : هەلآتنی خێراو بەترسەوە.

*- **تێکوەرانێ** : زۆرانبازی.

*- **تێمووم** : دەستنوێژهەڵگرتن بەخۆڵ لەجیاتی ئاو.

*- **تێڕاژۆتن** : بردنەناوشتێك.

*- **تیر** : نۆبەت، سرە، وەکوو (ئەوجارەی تیرێ منە) واتا نۆبەتی منە.

*- **تیرەمار** : ماری باریکی درێژ.

*- **تێرەخـۆرە** : ئەوەندەی برسی تێردەکات، ژەمی برسیەك، بەهاران کە گیا سەوز دەبێ.

*- **تیواوتیو** : تەنیشتاو تەنیشت، بەلاخواری.

*- **تیریێشك** : مۆرکی خۆشناوەتی پێوە دیارە، بە پارچە زەوی بچووك دەووترێت ، رووبەری زۆر گچکە بێت.

## ج

*- **جاڕس** : بەمنداڵی عیناد دەوترا.

*- **جاندار** : فیڵباز.

*- **جامباز** : بەفرت و فێڵ.دەلالی وولاخ فرۆشتن.

*- **جبۆ** : کورتکراوەی ناوی (جەبارو جوبڕائیل) .

*- **جزوە** : دەفری قاوە تێدا لێنان، قاوە جۆش.

*- **جزوبەند** : کتێب بەرگگردن بەهۆی (سلێرك) فەقێکان لەجیاتی (سیکۆتین) بەکاریان دەهێنا.

*- **جلیت** : هێرشکردن، پەلاماردان، بۆهیرش و پەلاماری ماربەکاردێت.

*- **جلوجۆڕ** : کەلوپەلی وولاخی باربەر.

*- **جەفت** : کلاوی بەڕوو، بۆخۆشکردنی پێستەبەکاریان دەهێنا.

*- **جەسارەت** : غیرەت و ئازایی.

*- **جەسوور** : بەتوانا بەغیرەت، ئازا.

*- **جەڕەبابۆ** : میزەڵان، دەبدەبە.

*- **جەرگ سۆتان** : بریتیە لەمردنی منداڵبەتایبەتی کەتەمەنی گەورەبێت.

*- **جەزرەبە** : ئازارو ئەشکەنجە.

*- **جەلی** : گوندێکە لەناحیەی سکتان.

*- جەلۆ : کورتکراوەی جەلال.

*- **جەمبوون** : کۆبوونەوە، خڕبوونەوە.

*- **جەنە** : یاخی بوون، یەکێك پێداگری لەسەر شتێك بکات.

*- **جوببە** : جۆرێکە لەکەوای مەلایان.

*- **جۆبرە** : کاتی برینەوەی مەڕویزن لەبەهاردا، لێکردنەوەی تووکی مەڕویزن.

*- **جۆرك** : لە قووماش دەیاندووری بۆ کەل و پەل تێکردن.





*- جۆنی : لەبەرد هەڵکۆڵراوە بۆکووتانی دانەوێڵە.

*- **جڕبەجڕ** : ووردکردن، دڕاندنی قوماش.

*- **جسن** : ڕەسەن .

*- **جوانە ماین** : بێچووی ماین کەوەکوو دایکی بێت.

*- **جینجر** : ماری دوورەنگ.

*- **جوانەمەرگ** : بەگەنجی مردن.گوڵێکی پاییزەیە لەناو باخچەکاندا دەڕوێ.

*- **جوایز** : جیاواز.

*- **جینگن** : ئەوکەسەی زوو توورە دەبێت و زوو دەگرییێ.شەڕانی ، نەگونجاو.

*- **جینگز** : سەگ ئەگەر زۆر بوەڕێ .

*- **جەور** : ئەزیەت، ئازار، ماندووبوون.

*- **جەوسان** : ناڕەوەست و عــەجول، بەتایبـەتی بۆمنــداڵێن بـەکاردێت، وەکــوو ئەڵێن (فلانە کەس هەندەجەوسێ) واتا ئەوەندە ناڕەوەســت و راوەســتانی نیــە، یان ئەڵێن (وەرزنەبووی لەجەوسانێ) واتا وەڕەز نەبووی لە سوڕان و گەڕانێ.

*- **جەوار** : گونیەی کۆن، لەداوی مووی بـزن دەپەشـتراو بـەهۆی کارگـەی جـۆلا دروست دەکرا، بۆتێکردن و پاراستن و گواستنەوەی دانەوێڵە بەکاریان دەهێنا.

*- **جەوهەردار** : خەنجەری هەرەباش، خاڵدار.

*- **جەوی** : ئەو چەوریەی کە هەندێ دار فڕێی دەدات.

*- جەوێ : کورتکراوەی ناوی جەواهیر، بۆبانگکردنی جەواهیر.

*- **جگ جگانە** : یاریەکی کۆنەیە.

*- **جوو** : پێشان لەخۆشناوەتی کاتی بووك گواستنەوە، ئەو کاتەی بـووك سـواری ئەسپ دەکرا، لەگوندێك بۆگوندێکی تر، ئەو کەسەی کە جـەرەوی وولاخەکـەی رادەکێشاپێیان دەگـوت جـوو، مەبەبەسـتیش لـەوە دیارەکـەکارێکی بێزێــزەو شایەنی جووە.

*- **جوغز** : یاریەکی کۆنە، تۆپیان لەپەڕۆی کۆنە دروست دەکردو یاریان پێدەکرد.

# چ

*- **چار** : چاڵ، جاران گەنمیان تیادا حەشاردەدا لەترسی دوژمن.

*- **چارەبەفر** : چاڵەبەفر، چاڵیان هەڵدەکەند بۆهەڵگرتنی بەفر بۆهاوین.

*- **چارشان** : مرۆڤی گەورەو شان و مل زل.

*- **چارپێ** : ووڵاخی بەرزە وەکوو (ئێسترو ماین و گوێ درێژ) .

*- **چارۆگ** : ئەو پارچە قوماشەی کە ژنان بەسەر سەریاندا دەدەن.

*- **چاری چاریانە** : سوار سوارانێ، رمبازی و سەرلەدوویەك نان بەووڵاخ، پێشبڕکێی سواران.

*- **چارمەشقی** : دانیشتنی پانەوپان.

*- **چاریار** : چوار جێنشینەکەی پێغەمبەر (د.خ) ، (ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان و عەلی) .

*- **چاکووپیر** : شەخص، ئەو گۆڕانەی کە خەڵك دەچنە سەریان بۆمرازو داخوازی.

*- **چاولێربوون** : بۆکەسێك بەکاردێت کەزۆرخەوی بێت، لەخەوان چاوی هەڵنەیەت.

*- **چاوهەرزڕای** : چاو گەورە.

*- **چاو بن پیارە** : چاو گەورە.

*- **چاو حیز** : جۆرە جنێوێك بوو .

*- **چاوبەلەبۆق** : چاو گەورە.

*- **چاوبەرەژێر** : بەرباری منەت، خەجاڵەت بەرانبەر کارێك.

*- **چاوتەنگ** : دەست قوچاو، رەزیل.

* - **چاوپێهەڵنەهاتن** : شەرمکردن، رك لێبوونەوە.
* - **چاووراو** : شات و شوت و درۆهەڵبەستە، خۆهەڵکێشان، چاوگێڕان.
* - **چاورشتن** : کل دەچاو کردن، خۆرازاندنەوە.
* - **چاووزار** : بەچاوی پیسەوە بوون، چاوی پیس لێدان.
* - **چاوشۆڕ** : خەجاڵەت، منەتبار.
* - **چاوکراوە** : تێگەیشتوو، شارەزا، لەدنیازان.
* - **چاولەدوو** : بەئاواتی یەکێك، بەتەمابوونی یەکێك بۆیەکێکی تر.
* - چاولەدەر : یەکێك نەچێتەوە ماڵەوەو لەم دەرك و لەو دەرك بسووڕێتەوە.
* - **چاوکسۆك** : ئەوانەی چاویان سوورە.
* - **چاوشلووکانە** : جۆرە یاریەکی منداڵانە بوو ، کەبەشەو دەکرا، دووگرووپ یەکیان خۆیان دەشاردەوە، ئەوی تریش بەدوایاندا دەچوون بۆدۆزینەوەیان ، بەواتای خۆحەشاردان.
* - **چارێی؟** : چ دەڵێی؟
* - **چەپەر** : دیواری بە شوول و شووی داردروستکرابێ.
* - **چەپەر** : پیس و پۆخڵ.
* - **چەپرەك** : یەکێك زۆر بەساڵدا چووبێت و کاری پێنەکرێت.
* - **چەپلەر** : نەزان، کەمزان، کەسێك کەبەدەستی چەپە ئیش بکات.
* - **چەتە** : رێگر.
* - **چەتەگەری** : یەکێك ئیش و کاری رێگریکردن بێت.
* - **چەتیم** : کچی بێ دایك و باوك، دواندنی ژن بەسووکایەتی.
* - **چەچی** : دەست بەزمانی منداڵان.
* - **چەخماغ** : چەرخ، ئامرازی ئاگرکردنەوە.
* - **چەرچی** : فرۆشیاری گەڕیدە، دەست فرۆش.
* - **چەرخان** : سوڕاندنی شتێك بە دیوێکی تر.

*- **چەرمسین** : سیس بوون، ژاکان.

*- **چەکچەکیلە** : شەمشەمەکوێر.

*- **چەکلەر** : لەکارکەوتوو، کەسێك یان شتێك کەکۆن بووبێ و کاری پێنەکرێ.

*- **چەلاّك** : گۆپاڵ.گۆچان.

*- **چەرتووك** : برنج بەتوێکڵەوە.

*- **چەرێی؟** : چ دەڵێی.

*- **چەمارۆ** : بەردەوامبوون لەکارێك، پێداگری، وازنەهێنان.

*- **چەغەتوولانە** : شەو رەوە سەگ بەدوای یەك دەکەون و رادەکەن و دەڕەون، ئەوە چەغەتوولانەی پێدەڵێن.

*- **چەهرە** : روو، دەمووچاو، سیما.

*- **چورچە** : مرۆڤی لەڕولاواز.

*- **چورچ و لۆچ** : ژاکان و بەسەریەکداهاتنی پێست.

*- **چرك** : چەوری، قرێژ، پیسی.

*- **چرگ** : ئاژەڵێکی قەڵەوە.

*- **چڕنوك** : نینۆکی تیژی پشیلەو دڕندە.

*- **چز** : شوێنی پێوەدانی دووپشك و زەرگەتە، پێوەنووسانی گەرمی سوتێنەر بەپێستەوە، دەنگی داغکردن و قرچاندنەوەی رۆن.

*- **چش** : هیچ شتێك، (چت هەیە؟) چش.

*- **چڕپاو** : چڵپاو قوڕولیتە.

*- **چڕپ** و لیس : دەنگی ئاوخواردنەوەی سەگ و پشیلە.

*- **چلێس** : نەوسن، چاوچنۆك لەخواردن.

*- **چنجڕۆك** : نینۆکی تیژ.

*- **چورچەمەن** : ئەم وشەیە بەواتای مرۆڤی لەڕولاواز دێت، بەتایبەتی بۆ منداڵ زۆربەکاردێت کەلاوازو نابووت بێت.

*- **چوشتیر** : گیسکە مێی دووساڵی کە نەزابێ.

*- **چویت** : باڵندەی دارکونکەر، دارکونێرە.

*- **چیرەدرێژ** : زۆربڵێ، زۆر گۆتن بەجۆرێك کەبەرانبەرەکەی تواناى نەمابێ.

*- **چێشتەنگاو** : خواردنی لەسەر ئیش پێش نیوەڕۆ.

*- **چێشتەنوێژ** : نوێژی سوننەت لەنێوان بەیانی و نیوەڕۆ.

*- **چەقەتە** : پێش کوڵانی تەواوی گۆشت ، واتا هێشتا نەکوڵاوەو سوورنەبۆتەوە.

*- **چەنە** : دارِمانی زەوی.

*- **چەنەچەن** : بەواتای زۆرگۆتن و زۆربڵێیی دێت.

*- **چەنەباز** : یەکێکی زۆربڵێ کەقسەکانی لەجێی خۆیدانەبێ.

*- **چەرت** : ئەم وشەیە بۆ لەیەك جیاکردنەوەی کارو بەرخ لە بزن و مەڕ دێت.

*- **چەورە** : جۆرە گیایەکی کوێستانیە، بۆمەڕوبزن هاوینان دەیدوورنەوەو بۆزستان دایدەنێن، گیایەکی خۆرایەو ئاژەڵ حەزی لێدەکات.

*- **چڕدۆ** : ئەم زاراوەیە بەواتای ئەوە دێت ئەو بزن و مەڕو مانگایانەی کە شیر نادەنە کابان و بێری، هەروەها بۆمرۆڤی رەزیلیش بەکاردێت، یەکێك رەزیل و بەخیل بێ ئەڵێن مرۆڤێکی چڕدۆیە.

*- **چیچیلە** : ئەونەرماییەی خواررووی گوێ.

*- **چنێران** : گوندێکی بچوکە لە رۆژهەڵاتی شەقڵاوە.

*- **چۆپان** : بۆئەو کەسانە بەکاردێت کەبەدەستی چەپە نانبخۆن و ئیش بە دەستی چەپەبکەن.

*- **چیوە** : دوو گوندن کەوتوونەتە بناری هەورێ (چیوەی سەروو و خواروو) سەربەناحیەی بێتواتەن.



# ح

*- **حاجی حەمەد** : گوندێکە لەبناری سەری رەش.

*- **حاجیلە** : گوڵێکی سپی ناو زەردە، گیایەکە زۆرتاڵەو لەناو دەغڵدا دەڕوێ.

*- **حادز** : عادز، توورەبوو لەیەکێك.

*- **حاستەم** : لەسەرخۆ، بەهێمنی، بەووریایی.

*- **حاستەم و دووبەرا** : کەمێك، تۆزێك.

*- **حاشاوەلیللا** : بەهیچ بارێکدانا، ناهەرگیز.

*- **حاشتەبا** : هیچ شتێك، (حاشتەبای شك نابەم) .

*- **حان** : دەم، جێگە، کات، (لەو حانەی راوەستابووم) .

*- **حاند** : جێگەیەکی دیار.

*- **حای!** : وشەی سەرسوڕمان، تەعەجوب.

*- **حـوج** : ناوێکە لەچیرۆکە ئەفسانەییەکاندا هاتووە (حـوجی کـوڕی حـەللاق) ، بەواتای مرۆڤی زۆر درێژی ناشرین.

*- **حورچ** : ژنی پرچ تێکەڵ و پێکەڵ کەبەشانە سەری دانەهێنابێ.

*- حورمێ : بانگکردنی ژن لەلایەن مێردیەوە.

*- **حوشترالووك** : گیایەکی دڕکاویە، ووشترخۆرە.

*- **حۆتیکە** : بۆ منداڵ بەکاردێ ، کەپێی بڵێی دانیشە.

*- **حوحانە** : جۆرە یاریەکی منداڵێن بوو ، بەتایبەتی کچان ئەم یاریەیان دەکرد.

*- **حوجران** : گوندێکە لەسەرێگای مەسیف_شەقڵاوە.

*- **حوسە** : کورتکراوەی ناوی حوسێن.

*- **حوسکە** : کورتکراوەی ناوی حوسێن.

*- **حوسێنکە** : سوککردنی ناوی حوسێن.

*- **حوسێنۆکە** : یەکێك لەڕولاواز و غەریب و ماڵ وێران بێ.

*- **حوسێنیلە** : حوسێنی منداڵ بۆخۆشەویستی بانگی بکەن.

*- **حەسەنکە** : سووککردنی ناوی حەسەن.

*- **حۆق** : هێڵنجدان بۆ رشانەوە.

*- **حۆقە** : کێشێکە سێ کیلۆ یان چوارکیلۆ.

*- **حللور بللوور** : یاریەکی منداڵێنەیە.

*- **حەپەت** : کورتکراوی ناوی (حەمەد) ، سووککردنی ناوی حەمەد.

*- **حەپ و تەپ** : یەکێك زۆر ماندوو بوو‌بێت و زوو خەوی لێبکەوێت، بێدەنگ بوون.

*- **حەپلە حورچ** : کورتەبالای قەڵەو.

*- **حەپلەگون** : گێلۆکە، کەمێك نەزان، تێنەگەیشتوو.گون گەورە.

*- **حەپین** : رەوینی سەگ، حەپەحەپی سەگ.

*- **حەتار** : وردەواڵە فرۆشی گەڕۆك.

*- **حەتر** : عەتر، گولاو.

*- **حەح** : وشەی سەرسوڕمان.

*- **حەچچە** : وشەی لێخوڕینی گوێدرێژ.

*- **حەککوو** : وشەی سەرسوڕمان.

*- **حەستەم** : کەمێك، برێك.

*- **حەفتلۆ** : جۆرێکەلەنەخۆشی کەوان و قونێر.

*- **حەقەپەرە** : هەرەتی باران بارینی پەڵەی پاییز.

*- **حەلانە** : خورمای لەحەسیر پێچراو.

*- **حەلووکە** : هەڵوچە، گەراز.



*- **حەلوەلا** : پەلەپەل و تەنگانە، یەکێك باری تەندروستی ودارایی باش نەبێ.

*- **حەل** : کورتکراوەی ناوی حەلیمە.

*- **حەلێ** : کورتکراوەی ناوی حەلیمە.

*- **حەلۆکە** : منداڵێك ناوی حەلیمە بێت لەخۆشەویستی وای پێدەڵێن.

*- **حەلیمەتە** : قورس و گران کردنی ناوی حەلیمە، بەژنە بەساڵاچوەکانی ناو حەلیمە دەڵێن.

*- **حەلیمۆکە** : حەلیمەی منداڵی رەزا شیرین.

*- **حەمۆ** : کورتکراوەی ناوی (حەمەدەمین) .

*- **حەوجە** : پێویستی پێبوون، وەکوو (حەوجە بەتوونابم) واتا پێویستیم بەتۆنابێ.

*- **حەوق** : گیروگرفتی بێدەرەتان، گرفتاری.

*- **حەویان** : ئاژەڵ، حەیوان.

*- **حەوجۆش** : جۆرێك بوو لەو کەلوپەلانەی بۆئاو تێکردن بەکاردەهات و لەقوڕدروست دەکرا.

*- **حەتۆتە** : جاران چەند بۆنێکیان لەناو چەند پارچە قوماشێك دەدووری، و بەداری لانکیان وەدەکرد، بۆئەوەی لانك بۆن خۆش بکات، لەهەندێ شوێن (حەت حەتەی ) پێدەڵێن.

*- **حەی!** : وشەی سەرسوڕمان.

*- **حەیام** : دەوروزەمانە، رۆژگار.

*- **حەیان** : مەعلوم، زانراو.

*- **حەیتە** : تەژی و ناقۆڵا، پیاوی بەردەستی ئاغا.

*- **حەینەن** : هەروەك، تەواو لەشێوەی ئەو .

*- **حەیش** : ناوی ژنانەیە.

*- **حەیامەکە** : لە ایامیکی عەرەبیەوە هاتووە، بەواتای ماوەیەکە.

*- **حەپەحەپ** : یەکێك قسەی نابەجێ بکات پێیدەڵێن حەپەحەپێ مەکە، بەواتای ڕەوینی سەگ دێت.

*- **حەزیا** : ماری زۆر گەورە.

*- **حەقلە بەقۆ** : دوو واتا دەبەخشێ یەکەمیان : کێشەیەك هەبێ لەنێوان دوو کەس هەندێ کەسی تریش خۆیان بخزێننە ناو کێشەکە ئەڵێن کێشەکە گەورە بووەو بۆتە (حەقلبەقۆ) واتا گەورە بووە، دووەمیان : کارێك کۆتاییەکەی ببێتە گاڵتە ئەڵێن بووە حەقلە بەقۆ.

*- **حونەری** : بەواتای کارێك دێ کە هیچ هونەرێکی تیادانەبێ.

*- **حەزحەزۆکانێ** : دڵداری کردن، حەزلەیەك کردنی کوڕوکچ.

*- **حەوشەمیز** : دروستکردنی حەوشێك لەسەر پارچە زەویەك بۆداکردنی (گاڕان) یان (مێگەلی بزن و مەڕ) لەوەرزی پاییزدایان بەهاراندا، بۆئەوەی زەویەکە تام بگرێ ، لەجیاتی کیمیای ئێستا .

*- **حەمایل** : ئەو کەسانەی کەنەخۆشی دەروونیان تووش دەبوو، دەیانبردە لای شێخێك ، شێخەکە چەند ئایەت و دوعاو پاڕانەوەی بۆ لە کاغەزێك دەنووسی و لەبەرگێکدا دەدروا و بەبەنێك لەملی نەخۆشەکەیان دەکرد ، لەنووشتە گەورەترەو حەمایلی پێدەڵێن.

*- **حەمام** : ئەو کەسانەی کەتووشی نەخۆشی دەبوون بەتایبەتی نەخۆشیەکانی پشت ئێشان و نەخۆشیەکانی تر ، هەندێ کایان لەناومەنجەڵێك ئاودا دەکوڵاندو پارچە رایەخێکیان لەسەر مەنجەڵەکەدا دادەنا و نەخۆشەکە دەچووە سەر مەنجەڵەکەو دادەنیش تاکوو ماوەیەك ئارەقەی دەکرد، بەمەیان دەگووت حەمام.

*- **حەمیکە** : عافێتیکەو بیخۆ بەتایبەتی ئەم زاراوەیە بۆ منداڵێن بەکاردێ، کە بتەوێ خواردنێکی دەرخوارد بدەی.

*- **حوشتر** : ووشتر.



*- **حێدز** : تووڕە، عادز.

*- **حیساب** زان : زانا لەژماردن، عاقڵ و زیرەك، شارەزا لەکەشناسی.

*- **حیلەحیل** : دەنگی ئەسپ و ماین.

*- **حێشتر** : ووشتر.

*- **حینك** : ئەم زاراوەیە منداڵ وەکوو جنێو بەکاری دێنن، خۆیان بەپشتدا دەشکێننەوە و ئەڵێن (حینکەکت لێدەم؟) جوێنێکی زۆر پیسەو بۆجووت بوونی ژن و مێردیش بەکاردێت کاتی خۆهینان و بردن و خۆپێدادان.

*- **حینگەشەلە** : بۆئەو کەسان بەکاردێت کەقاچیان شکابێ و بەرەو چاکبوونەوە بڕوات و دارە دارە بکات، حینگەشەلەی پێدەڵێن.

## خ

*- **خاپەرۆك** : کۆتایی هەرشتێك، دوای دارنینی گوێز و هەر بەروبوومێکی تر ئەوەی دەمێنێتەوە خاپەرۆکی پێدەڵێن.

*- **خاتروخۆتر** : کەین و بەین، لایەنگیری لەیەك کردن.

*- **خاتر** : ناوی ژنانەیە.

*- **خاتوون** : ناوی ژنانەیە.

*- **خاتوون** : وشەیەکە بۆ رێزلێنانی ژنان.

*- **خان چی** : جاران لەجیاتی میوانخانەو هوتێلی ئێستا چەن خانووی گەورە لەشارەکاندا هەبوون کەهەم کاروانچیەکان لێی دەنووستن هەم وولاخەکانیشیان دەحەواندەوە.خاوەنی کاروان سەرا.

*- **خانیلە** : خانووی کەمندالّ لەبەردوخۆلّ دروستی دەکەن.

*- **خانەدان** : نەجیب زادە، بنچینە ئەسلّ، مالّی گەورەی بەمیوان.

*- **خانەخەراب** : مالّ وێران، بیّ بەخت و کلۆلّ.

*- **خانیّ** : بانگکردنی ژن بەرێزەوە، کورتکراوەی ناوی خانزاد.

*- **خاوی** : شلی و تەنبەلّی، کالّی، نەگەیشتوو، نەکولاّوی.

*- **خارۆزە** : جۆرێکە لەرووەك وەکوو نەخۆشی وایە بۆکشتوکالّ ، رەنگی زەردەو باریکە و خۆی دەئالّێنێتە شینایی ووشکی دەکات.

*- **خاراندن** : پێستەی ئاژەلّ نەرم دەکرێت و ئامادەدەکرێت.

*- **خارا** : لێراهات.



*- **خارە رەش** : جۆرە گیایەکە لەدەم ئاوی نزیك بەردوشاخ دەڕوێ، وەکوو چارەسەری گورچیلە بەکاردێت.

*- **خاوو خلیچ** : بۆکەسانی لەسەرخۆو هیواش لەکارکردندا بەکاردێت.

*- **خاسۆر** : بەرزایی یەکە لە سەرووی گوندی خەتێ.

*- **خەبەریتی** : راستە، قسەی تۆیە.

*- **خەساندن** : دەرهێنان یان بردنە پشتەوەی گونی ئاژەڵی وەکوو (گیسك و نێری و ئەسپ و کەر) .

*- **خەساس** : ئەو کەسەی کە ئاژەڵ دەخەسێنێ.

*- **خەمیس** : کوتانی مێوژلەگەڵ کاکڵەی گوێز بە ئاون یان بە جۆنی، دوایی خڕیان دەکردن و بەتام و لەزەت بوون.

*- **خەمەگرۆو** : جۆرە گیان لەبەرێکی خشۆکە، زۆربەی ژیانی لەسەر بەردەگەورەکانە، سەری بەرز دەکاتەوە، لای هەندێك کەس وایە کەکوشتنی خێرە.

*- **خەربەندە** : بەو کەسە دەووترێت کەلەکاتی شەڕدائێستر یان کەری پێیە، بەپشتی وولاخ خواردن و ئاو و هاوکاری بۆبەرەکانی شەڕ دەگوازێتەوە.

*- **خەلۆ** : کورتکراوەی ناوی (خالیدو خەلیل) .

*- **ختتە** : وشەیەکە بۆدەرکردنی پشیلە بەکاردێ.

*- **ختك** : پشیلە.

*- **خچخچ** : وشەی بانگکردنی بزن و گیسك .

*- خدرولاس : ناوەڕاستی مانگی رەشەمێ، (خدرولاس ، ساربووخەلاس) .

*- **خڕ** : ئەو کەندەی کە ئاوی تیادایەو دەڕژێتە رووبار.

*- **خڕکە** : بەبەردی خڕ دەووترێت.

*- **خراز** : لەمووی بزن دەپەشترێ و بەهۆی کارگەی جۆلایی رایەڵ دەکرێ و وەکوو گونیەو گوش بەکاردەهات.

* - **خشتوور** : بەواتای ویران دێت.
* - **خشخشۆك** : شوێنێك سەرەو ژێربێ ، بۆیاریکردنی خۆغلۆرکردن.
* - **خەفە** : کزکردنی فانۆس، واتا خامۆشکردن.
* - **خەفتیانە** : خۆئامادەکردن بۆسەفەرێك یان کارێك.
* - **خەپشە** : هینی ژن، وانەکی ژن.
* - **خەتێ** : گوندێکی خۆشناوەتیە سەربەناحیەی بالیسانە.
* - **خەجێ** : کورتکراوەی ناوی (خەدیجە) .
* - **خەجۆك** : خەدیجەی خۆشەویست.
* - **خەجیلە** : خەدیجەی راژیلەی ماڵوێران.
* - **خەجیجۆکە** : خەدیجەی بەساڵدا چوو.
* - **خەرا** : تێکچوو، ویران، نارەسەن.
* - **خەزایی** : جۆرە باڵندەیەکە دوژمنی کلۆیە.
* - **خەلا** : ئاودەستی گشتی ژنان و پیاوان.
* - **خسکە** : پیازی وورد کەلەجیاتی تۆ دەیچێنن.
* - **خشتکردن** : برینی شتێك بەرێکی.
* - **خشین** : رۆیشتن بەنەرمی.
* - **خشتووخار** : پاشماوە، زبڵ.
* - **خلیسك** : شوێنی لووسی سەربەفر.
* - **خلیسکانێ** : یاری و گەمەی سەربەفر.
* - **خم** : هەش، بەری گیایەکە خام و بەنی پێ شین دەکەن.
* - **خمخانە** : دووکانی رەنگکردنی بەن و قوماشی سپی.دووکانی خمکردن.
* - **خمسان** : توانەوە، نەرمبوون.
* - **خواروخێچ** : ناراست، خوارو گرێدار.

*- **خۆشاو** : مێوژ لەئاو دەکرێت و پاش ماوەیەك ئاوەکەی وەکوو شەربەتی لێدێ و بەتامە.

*- **خۆران** : گوندێکە لە دۆڵی قەڵا سنج.

*- **خۆماریکردن** : خۆئامادەکردن و نەوی کردن بۆ شوێنێك چوون.

*- **خۆران** : گوندێکە لەدۆڵی بالیسان.

*- **خۆرەبان** : گلڕێژکردنی سەربان.

*- **خۆڕەپێشکردن** : خۆبردنەپێش، هەوڵدان بۆناووناوبانگ و گەورەیی.

*- **خۆبەردانەوە** : تەمبەڵی کردن بەئانقەست لەکردنی کاردا، خۆدزینەوە لەئیش.

*- **خۆپەسمین** : کەسێك کەتەنها خۆی لا گەورەبێ.

*- **خۆی تێکە** : هاندانی سەگ بۆ پەلامار.

*- **خوچێ** : خوشکم لەزاراوەی ژناندا.

*- **خوچۆکە** : کیژی زۆر ووردیلەو بچووك.

*- **خورت** : بەهێز، بەتوانا.

*- **خۆش** بە : زووبە، خێراکە (دەخۆش بە وەرە درەنگە) .

*- **خۆکەرکردن** : خۆبەنەزان و نەفام نیشان دان، کێشە دروستکردن بۆخەڵك.

*- **خۆکەڕکردن** : گوێ نەدان بەفەرمان بەئانقەست.

*- **خۆتێهەرسوین** : خۆنزیككردنەوەو خۆلێخشاندن.

*- **خۆگۆڕین** : جلکێکی تر دەبەرکردن، خۆنیشاندانێکی تر کەهەیە.

*- خۆڵەگەزدان : راکشان، راست راکشان بەجۆرێك بێ گرێ .

*- **خۆناسین** : بالغ بوون، دەخۆگەیشتن، شەیتانی بوونی کچان.

*- **خولاسە** : پوختە، پوختەی ووتاروەکوو (خولاسەی کەلام) .

*- **خولق** : خوو، ئاکار، (پیاوەکی خولق خۆشە) ، بانگکردن بۆبەشداربوون (خولقی کردم بچمە ماری تانانی دەگەربخۆم) .





*- **خوین دیتن** : کەوتنە حەیزی ژنان.

*- **خۆگیرکردن** : خۆدواخستن، درەنگ هاتنەوە.

*- **خواس** : بێ پێڵاو (پێ خواس) .

*- **خوسان** : نەرم بوونەوە.

*- **خوترە** : دارێکی گەورە بۆلێدان، بەرچیخ.

*- **خیت خیتە** : هاندانی کەسێك بۆشەڕ.

*- **خێروشەڕ** : بردنی خواردن بۆئەو ماڵانەی کەتازیەو پرسەیان هەیە.

*- **خنس بەچە** : مرۆڤی هیچ و پووچ.ناکەس بەچە.

*- **خنێ** : گەردن.

*- **خورین** : بەو کەسانە دەووترێت کەبرسی بن و هیچیان نـەخواردبێ بەتایبـەتی بەیانیان .

*- **خوانچە** : سنی.

*- **خویزی** : تف.

*- خویزاو : ئەو خوێنەی کەلە برین دەچۆڕێتەوە.

*- **خوێرز** : ئەو بەردە پانانەی لەتەنیشت یەکن کە خوێی بەسەردا دەکەن بۆمـەڕو بزن.

*- **خوێراوك** : خوێ لەواو کردن و تێکدانی.

*- **خوێ واوك** : خوێ لەئاودا توانەوە.

*- **خوین سارد** : نابەدڵ، ناگەرموو گوڕ، ناخۆشەویست.

*- **خوین** : خوێن، خێن، خوون.



## د

*- **دابەستی** : ئەم زاراوەیە بەو گیسك و بەرخانە دەووترێت کەهاوینان لەماڵــەوە بەخێوی دەکەن بۆپاییز و دەیکوژنەوە.

*- **داپیرحولك** : پیرە ژنی بێرەزاو گەورە.

*- **داپیرۆچکە** : جالجالۆکە.

*- **داتەکاندن** : لەسەرەوە بۆرخوارەوە راوەشاندن، تۆز لێکردنەوە.

*- **داچاندن** : تۆیەزەویەوە کردن.

*- **داچۆڕان** : هاتنەخوارەوەی ئاوی کەم لەسەرەوە بۆخوارەوە.

*- **داخوران** : خزینی گــڵ و خــۆڵ بــەهۆی ئــاوەوە، نــەوی بــوونی دیــوار بــەهۆی داخزانەوە.

*- **دادۆکە** : منداڵی گچکە کە کچ بێ و بەپێیان بڕوا.

*- **دادیلە** : وشەی دواندنی خوشکی گچکە.

*- **دادەی** : کوابزانم، کوا پیشانم دە، بزانم چۆنە.

*- **دارك** : قەدی توورتن کە گەڵای توورتنی لێکرابێتەوە.

*- **دارکونێرە** : باڵندەیەکە پیشەی کوونکردنی دارە، چویت.

*- **دارزێی** : وشەیەکە بۆ تەریقکردنەوەی کەسێك دێ کە کاری نابەجێی کردبێ.

*- **دارنین** : لێکردنەوەی گەڵا لەدار.

*- **داروجان** : دەنکێکی رەشە لەناو برنجدا.

*- **داروسکان** : دارێك زۆر بەری گرتبێ و قەدەکانی بۆسەرزەوی شۆڕ ببنەوە.

*- **داردۆخین** : ئەو دارەی کە کونکراوەو باریکە بۆ تێخستنی دۆخین لـە شـلوارو دەرپێ بەکاردێ.

*- **داغکردن** : بەئاسنی سوورەوە بوو چزاندن، چزانەوەی رۆن.

*- **داسی** : جۆرێکە لەدرِك .

*- **داسنی** : غەیرەدین، لەسەرئاییینی زەردەشتی.

*- **دامارندن** : لەسەرەوە بۆخوارەوە داخزاندن ، شێلان بەدەست (هەنـدەك پشـتێم دامارە) .

***دامران** : کوژانەوەو خەفەبوونی ئاگر.

*- **دامەن** : خوارو، باشوور.داوێن ، (ئاگات لێبی دامەنت تەرِنەبن) .

*- **دان** : بەخشین، خۆراکی مریشك ، تۆو (هێشتا گەنم دانی نەگرتیە) .

*- **داندۆك** : گەنم بەدۆکەشك، خواردنێکی کوردەوارییە.

*- **دانکە** : ئاولەی بالنـدە، خرووکـەی مریشـك، ئاولـەی مـەرِوبزن کەلـە دەم و چاویان دەردەکەون.

*- **دانوماش** : یەکێك تـازە سـەری سـپی بـووبێ، گـەنم و مـاش، لەگـەڵ یـەك نەگونجان (دانوماشن دەگەرێگەی ناکوری) .

*- **داوەراندن** : لەبەرزەوە رژاندنـە خـوارەوە، لێکردنـە، (هەرِوەسـەرتوێ ، تـوان داوەرینە) .

*- **داك** : بەدایك دەووترێت.

*- **داکاسێ** : منداڵێك گەر زۆر عـەجوول و نارِەوەسـت بـێ ، دایکـی پێیـدەڵێ دەداکاسێ، واتا دەدانیشە.

*- **داکـەمار** : لەمارمێلکە گەورە ترەو رەنگی سەوزە، ئەگـەر یـەکێك کـردەوەی باش نەبێت پێیدەڵێن (بلعات داکەمار) .

*- **داهێ** : ئادەی، ئەگەر بتەوێ شتێك ببینی و لەدەست یەکێکی تر بێت ئـەڵێن داهێ ببینم.

*- **دارەباز** : دارمەیت، ئەو دووداره درێژەیە کەتەرمی مردووی پێدەگوازنەوە بۆسەر گۆڕستان.

*- **دارمەعموور** : چەند پارچە دارێکیان لەیەك قایم دەکرد و لەسەر پشتنی وولاخیان دادەنا بۆگواستنەوەی بەرد بۆخانوو.

*- **دارەش** : جۆرێکە لە باڵندەو لەکۆمەڵەی بازە.

*- **داودۆز** : کەو چەندجارێك کەوتبێتە ناو داوو رزگاری بووبێ.

*- **دایسێ** : ئاگرلەگڕدایە، ئاگر هەڵبووە.

*- دەبەرکردن : پۆشینی جلوبەرگ، لەنێوقەدەوە هەرجلکێك بپۆشی دەبەرکردنی پێدەڵێن، وەکوو (کراس، فانیلە، قەمسەلە، جلوبەرگی تر، ) .

*- **دەپێکردن** : هەرجلوبەرگێکی وەکوو (دەرپێ، بیجامە، دەرپێ قوتە، شەروار، پانتۆڵ) وە (گۆری و پێڵاو) کەلەلایەن پێیەوە بیپۆشی ، دەپێکردنی پێدەڵێن.

*- **دەبیرەخەو** : یەکێك خەواڵوەو دەیەوێت بنوێ، خەوی لێبکەوێ و دوایی هەڵسێتەوە، ئەڵێ دەبیرەخەو راچووم ، واتا خەوم لێکەوت و لێنەکەوت.

*- **دەبەرمردن** : بەقوربان بوون.

*- **دەسەرگەڕان** : ئاگا لێبوون لەکار، بەقوربان بوون.

*- **دەدەورگەڕان** : سوڕانەوە لەدەور، بەقوربانی و سەدەقەبوون.

*- **دەوکە** : منداڵ زۆر بگریێ ، ناوەناوە دەنگێکی لەکاتی گریان لێوەدێ.

*- **دەستەبەرد** : بەو بەردانە دەووترێت کەپڕ بەدەستن.

*- **دەست و پێ سپی** : بۆئەو کەسانە بەکاردێ کەکاریان پێنەکرێ، یان هێواش بن لەکاردا، یان تەمبەڵ و تەوەزەل بن لەئیشدا.

*- **دەستەوا** : بۆچەند مەبەستێك بەکاردێ، یەکەمیان : یەکێك کارێك بۆکەسێکی تربکات بێپارەو پێیدەڵێ دوایی وەرە کارێکم بۆبکەوە، دووەمیان : یەکێك کارامە بێت لە چێشت لێنان شیوی خۆشبن، ئەڵێن دەستەوای خۆشە.

*- **دەست بەئاوگەیاندن** : چوونە ئاودەست، خۆخاڵی کردن.

*- **دەستەخوشك** : دۆستایەتی لەنێوان کچان.

*- **دەست کەلا** : ئەو کەلایەی کەیاری پێدەکرێ لەکەلایەکانی تر جوانترو گەورەترە.

*- **دەمەقاری** : قسەبەیەك ووتن ، جنێویەیەك دان.

*- **دەنگودۆر** : پڕوپاگەندەکردن لەدوو یەکێك، ئەڵێن دەنگودۆرە لەدوو فلان کەسی.

*- **دەو پیس** : بۆئەو کەسانە بەکاردێت کەهەمیشە جنێو بەخەڵك بدات.

*- **دەوئەشکەلك** : یەکێك دەمی زۆر گەورە بێت.

*- **دەولك** : جاران بەهۆی نەبوونیەوە لەجیاتی زەمبیلی ئێستا ، دەولکیان لە پێستی ئاژەڵ دروست دەکرد، بەهاوینان رەق دەبوو ، بۆلێکردنەوەو هەڵگرتنی هەنجیر بەکاردەهات.

*- **دەر** : ئەو رێگا سەخت و هەورازانەی کەلە چیای زۆر سەختدا تێپەڕدەبێت ، وەکوو (دەرەدار، دەرەشێر، دەرەزێوە، دەرەهەرتەل) زۆربەی ئەو رێگایانە بەدەست دروستکراون و دیواریان بۆهەڵچنیون.

*- **دەربەند** : گوندێکە لەنزیك شەقڵاوە.

*- **دەراو** : جۆرێکە لەگیا، لەدەم ئاودا دەڕوێ ، بۆخۆراکی دابەستی بەکاری دێنن، هەروەها بۆسەرکەپری نووستنیش بەکاردێت، نەرم خۆشە بۆنووستن.

*- **دەراش** : گوندێکە بەرانبەر بالیسان.

*- **دەزبێن** : ئەم زاراوەیە تایبەتە بە کۆچەری و شوانکارەکان ، لەکاتی شەویندا و لەچیا و لەوەڕگاکاندا شوان پشتێنی یان هەرپەتێك بێت سەرێکی لەدەستی خۆی دەئاڵێنێ و سەرەکەی تریش لەملی بزنێك یان مەڕێك دەبەستێتەوە، جاری واهەیە شوان خەوی لێدەکەوێ ، لەکاتی رەوینەوەی مێگەل یان رۆیشتنی یان لەکاتی گورگ هاتنە ناو مێگەل ، بەهۆی ئەو پەتەوە شوانەکە بەخەبەر دێت ، بەو پەتە دەوترێت دەزبێن.



*- **دەزگر** : پەڕۆی شتی گەرم پێگرتن.

*- **دەهەندە** : بەڵێ وایە، زۆر راستە، گەواهی دان بۆ قسەیەك كەراست و رەوان بێت.

*- **دواوە** : گوندێكە لەخواروی بێتواتە.

*- **دووكانە** : داربەڕوو و دارمازیە بەتەمەنەكان لەناوقەدیان دارێكی تریان لێدەڕوێ، بەرێك دەدات وورده و رەنگیان زەردە، بۆدەرمانی كوردەواری بەكاردێت ، ئەمە دووكانەی پێدەڵێن.

*- **دۆرە مەڕ** : بێل ، خاكەناس.

*- **دۆریخ** : دەركەی جاران لەداردروست دەكرا، ئەو دارەی كەلە ژوورەوە دەرگاكەی پێدادەخراو دەچووە ناو كونی دیوار.

*- **دۆرێ** : گوندێكە لەنزیك هیران.

*- **دۆغاو** : خواردنێكی كوردەواریە، كفتەیەو بەلاَم ماستی تێكەڵ دەكەن لەگەڵ نێركە پیاز.

*- دۆینێ بە زرەپوونگێ : هەم خواردنێكی كوردەواریەو هەمیش ئەگەر یەكێك تێكەڵ و پێكەڵ بكات ئەڵێن كردیە دۆینێ بەزرەپوونگێ، واتا ئیشەكەی كردە فشە.

*- **دژوون** : یەكێك ماوەیەك بێ خۆی نەشووشتبی و چلكن بێ.

*- **دێ** : ئەو چرۆو گەلاَی بەڕوو كەپاییزان دەیبڕن و لەسەر یەكی دادەنێن بۆزستان، دێیە چروو.

*- **دێمكە** : لەپێست دروست دەكرا بۆئاو تێكرد.

*- **دێرە** : نیشانەی مێیەتی كەلەپێش ناوی جانەوەر دەكەوێ وەكوو (دێرە سە، دێرە بەراز، دێرە گورگ) .

*- **دێرەبەبا** : مێیەی جانەوەری وەباهاتوو، نێرویست، حەزبەسێكسكردنی گیان لەبەر.

*- **دێرەلەبا** : مێیەی سەگی وەباهاتوو.

*- **دێرەکە** : مێیەی سەگ.

*- **دیژە** : بۆئەو کەسانە بەکاردێت کەساختەچین.

*- **دیمدان** : بۆچێشت و چایە بەکاردێت کەباش بکولێت.

*- **درخێورانەوە** : یەکێك قەستی رشـانەوە بکـات و دڵـی تێـك بچـێت، هەشـە برسێتی وای لێدەکات لیکاوی لەدەم بێتە دەرەوە.

*- **دڕ** : یەکێك زۆر ئازابێـت، یـان سـەگێك کەپـەلاماری مـرۆڤ بـدات ، ئـەڵێن سەیەکی دڕە.

*- **دڕی** : هەم جۆرێکە لە دڕك، هەم واتای تووتڕکە.

*- دریژ **بوون** : واتا راکشان ، پاڵدانەوە.

*- **درێشـە** : وەکـوو سـووژن وایـە، لای کورتـان دروو هەیـە، لەپارچـەدارێك قایمکراوە، بۆکونکردنی پێستەو شتی رەق بەکاردێت.

*- **درێشووکە** : زمانی مار کە دەری دێنێ.

*- **درپیسی** : دل پیسی ، بیرخراپ، دودل لەژن.

*- **دمك دمکانە** : شەڕە قسە، بەدەم شەڕکردن.

*- **دمڕووت** : گەنجی موو لێنەهاتوو، بێسمێڵ.

*- **دووبەرد** : هەردوو بەردی ناو گۆڕ، (هەتا لەناو دووبەردانم نەنێن لەبیرم ناچی) .

*- **دووگاسن** : زەوی دووجار کێڵراو.

*- **دۆخۆر** : ئاژەڵێك بەئەمانەت وەرگرتن بۆشـیر و دۆخـواردن و دواتـر دانـەوەی بەخاوەنی.

*- **دۆدی بۆدی** : مەکرباز، فێڵ و تەڵەکەبازی.

*- **دۆرە** تیر : دۆڵێکە لە گوندی (شێخ مەموودیانەوە دەستپێدەکات تاکوو سـەر زینەتیر) .

*- **دۆمبەران** : جۆرێکە لە (کوارگ ، کارگ، قارچك) خۆڵ بڵند دەکات ، بەهاران و پاییز لەدەورەی دارو تەڕاش دا دەردەچن.

*- **دۆرەنگێو** : دەهۆڵ لێدەر، زۆربلێ، نارەسەن و ناپەسەند.

*- **دۆرەدرێژ** : پەنجەی ناوەڕاست، یەکێك باڵای زۆربەرز بێت.

*- **دۆم** : هەمیشە، بەردەوام ، یەکێك خۆڕاگربێت لەسەر کارێك.

*- **دۆمی** : دۆستی راستەقینە، هاوڕێی بەوەفا.

*- **دوڕ** : لەناوەڕاست، ناوەند، (گەنمی لەدوڕ گوشی بکە) .

*- **دارگاز** : ئەو دارە دوولکەیە کەوا کورتان درووپووشی پێلەناو کورتان دەکات.

*- **دەوکەکردن** : منداڵێك زۆر بگریێ و دەنگێکی لێوەدێ.

*- **دەنگارە** : ئەو شاخانەی کە دەنـگ دەدەنـەوە، واتـا ئەگـەر لـەژێر شـاخێك بانگتکرد شاخەکە دەنگ دەداتەوە.

*- **دەغەر** : منداڵ ئەگەر وورگی گەورە بێت ، منداڵێك کەنەتوانێ بڕوا.

## ر

*- **راكردن** : راخستنی شت وەكوو ساوار، لەتكەتەماتــە، هەرشــتێكی تــر لەبــەر هەتاو.

*- **راتبە** : ئەو برە خواردنەی كەدەدرایە فەقێ.

*- **رازیانە** : جۆرە گیایەكە بۆدەرمان بەكاردێ.

*- **راوەرە** : جۆرە هەنجیرێكە زوو پێدەگات.

*- **راوەراندن** : داوەشاندنی بەرووبوومی وەكوو توو، گەراز، هەرشتێكی تر.

*- **رشك** : گەرای ئەسپێ، ئەسپێی گچكە.

*- **رشكن** : رشكاوی، چلكن ، بەئەسپێ.

*- **رسكا** : دوای كولاندنی دۆشاو، سركە، مرەببا ، واتا گۆڕانی رەنگ.

*- **رك** : هەورازی سەخت ، تووڕەیی و رق.

*- **ركبوونەوە** : تووڕە بوون لەیەكێك ، خۆشنەویستن، رق ئەستووربوون.

*- **رووتەرە** : پووتەكەی بێگۆشت، پووچە، ئاژەڵی تووك وەریو.

*- **رۆژە جۆت** : بەشی رۆژێك زەوی كێلان بەوولاخ.

*- **رووسپی** : مرۆڤی سەربەرز، بەئابروو، ئابڕوومەند.

*- **رووسپیەتی** : خوێنی نیشانەی كیژبوونی بووك.

*- **رووشكێن** : تەریق بوونەوە، خەجاڵەت بردنەوە.

*- **رووگرژ** : رووتاڵ، رووترش، دەمووچاو تێكنراو.

*- **روونیشین** : دانیشتن.

*- **رێشمە** : جەرەوی وولاخ.

*- **رێژنە** : بارانی بەخوڕو بەلێزمە.

*- **رینگژن** : دەنگی بەریەك كەوتنی قاپ و مەنجەل و شتی تر.



*- **ریخ** : پاشماوەی وولاخی بەرزە.

*- **ریس** : خوری و مەرەزو لۆکەی بەتەشی و خەرەك بادراو، (ریسم لێبووە خوری) .

*- **رینگۆر** : جل و بەرگی دڕاو ، شڕوشیتاڵ، بزگوڕ.

*- **رووبارە** : گوندێکی بچووکە لەدۆڵی بالیسان.

*- **رووگرتن** : پاییزان لەیەکەم باران باریندا خانوو هەندێ کای پێوەردەکەن و بەباگوردان دەیگێڕن، ئەمە رووگرتنی پێدەڵێن، هەروەها ئەم حاڵەتە بۆ گۆڕ (قەبر) یش بەکاردێت.

*- **رۆین** : رۆیشتن.

*- **رنۆك** : نینۆك، یەکێك بەنینۆك دەمووچاوی یەکێکی تر بریندار بکات، هەروەها رنۆك بۆ ئاژەڵیش بەکاردێت ، وەکوو (پشیلە بەرنۆك شەڕئەکات) .

*- **رنی** : رنیە بەفر، زستانان یان سەرەتای بەهار بەتایبەتی ئەگەر بەفر زۆر کەوتبێ بەفر دەڕمێ ، بەواتای دارمانی بەفر دێت.

*- **رەتاندن** : دەرپەڕاندن، پێ غاردان، راکردنی خێرا.

*- **رەهێر** : رەهێڵ، بارانی بەخوڕ.

*- **رەزگە** : گوندێکی خۆشناوەتیە لەدەشتی هەری سەربەناحیەی باسرمە.

*- **رەوگە** : ئەو هەنجیرو ترێیانەیە کە زووتر دەبن.

*- **رەشەراو** : ئەو شوێنەی کەبەفر بەهۆی ئاوەوە تواوەتەوە، بۆدانانی داوی راوکردنی پەلەوەر.

*- **رەشەراو** : راوکردن بەهەموو جۆرێك .

*- **رەشمیری** : جۆرێکی نایاب و دەنك گەورەی ترێی ۆرەشە.

*- **رەش و برش** : زۆر رەش، (رەنگی رەش و برشە) وە (رەش و برشێ ماچ بەتامێ) .

*- **رەمبژن** : دەنگێکی گەورەی بەهێزی لەناکاو.

*- **رووبێرە** : هەڵی قۆڕێنە، خوارنی شلەمەنی خواردن، خواردنێك بێئەوەی بیجوی.

# ز

*- **زان** : منداڵ بوون، لەدایك بوون، بەتایبەتی بئئاژەڵ بەکاردێ کە بێچوویان دەبێت، وەپاشگری بەمانای ئاگادارەوەکوو (پیاوەکی زۆرزانە، گەمەزانە، ) .

*- **زانەوێر** : بوێرو ئازا.

*- **زانەخرۆ** : سەگ یان هەر ماڵاتێك کە زیان بەماڵ و دراوسێ بگەیەنێ، شارەزالەماڵ.

*- **زانەوە** : کانی یان سەرچاوەی ئاو کەووشك بووبێ و دواتر ببوژێتەوەو ئاوی تیادابێ.

*- **زارك** : سەرەتای کوونێك، یان دەرگای خانوو.

*- **زاوابەندی** : زاوابچێتەوە سەرماڵی خەزوور.

*- **زنج** : کەپر یان کۆڵیتی ناو رەز ، ئەوانەی بەقەدی مێو دروست دەکرێن، بۆپاراستنی مێوژ و ترێ لەپاییزاندا.

*- **زبارە** : کاری هەرەوەزی.ئیشی بەکۆمەڵ.

*- **زندەقم چوو** : ترسام، زراوم چوو، یەکێك لەناکاوەوە بیترسێنی.

*- **زەندۆر** : ئەشکەوتی بەسەهۆڵ بەند، شوێنی زۆر قووڵ.

*- **زەنگەتە** : زەردەواڵە.

*- **زەریف** : بەتام، بەلەزەت.

*- **زەفت** : داگیرکردن، دەست بەسەرداگرتن.

*- **زەفت نابی** : بۆمنداڵ بەکاردێ، واتا دانیشتنی نیە.

*- **زەقنەبووت** : جۆرێکە لەجنێو بەواتای ژەهری مار.

*- **زەقنت بی** : خواردنەکەت نەکەوێتە گیانت، خۆشی لەخواردنەکە نەبینی.

*- **زەرتکان** : بەرزاییەکە لەنزیك کلاو قاسم.

*- **زەرگار** : کۆتەشیر، پێلاوی لەموو چنراو، گۆریەی تاژێرئەژنۆ.شیشی دەروێشان.

*- **زەوەزە** : منداڵ، کۆرپە.

*- **زەعیفە** : جاران بەژنیان دەووت .

*- **زڕ** : واتا نارەسەن، یان ئەگەر دارێك زۆر بەرز بێتەوەو هیچ بەرێك نەدات ئەڵێن زڕ بووە.

*- **زڕتەزەلام** : پیاوی زۆر گەورەو بەقەدوبالا.

*- **زڕگویز** : گوندێکی خۆشناوەتیە لەدۆڵی ئاژگە لەناحیەی پیرمام، دارگوێزی گەورەو بێبەر.

*- زرمە : دەنگ لێهاتن (زرمەی لێهینا) .

*- **زرینگ** و **هۆڕ** : دەنگی خشڵی زێڕوزیو کەژن لەبەری کردووەاەکاتی رۆیشتن دەنگی لێوەدێ.

*- **زگ سووتان** : منداڵ مردن.

*- **زل** : قەدی گیا بەووشکی.

*- **زەنگەسۆرە** : زەردەواڵەی گەورە، مەیلەو سوورە.

*- زیارەت : گوندێکە لەبناری سەفین.

*- **زیارەتی مەلازادان** : یەکەم گوندی خۆشناوەتیە لەسنووری پیرمام.

*- **زینەتیر** : بەرزاییەکە لەچیای بەنی هەریر.

*- **زێنە** : هاوینەهەوارێکە لە گوندی توتمە.

*- **زێوە** : گوندێکە لەسنووری ناحیەی بێتواتە، هەروەها هاوینەهەوارێکی دلڕفێنە.

*- **زیخان** : گوندێکە لەدۆڵی بالیسان.

*- **زیخمار** : ئەو شوێنانەن لەچیا کە هیچ گیایەك لێی ناڕوێ و سەرەژێرن و خاکەکەی گلێکە ، منداڵێن بۆ خۆخزاندن بەکاری دێنن.

*- **زیلك** : دوای کوژانەوەی ئاگر هەندی پەنگری وورد لەناو مشکیدا جێدەمێنێ .بەمە دەڵێن زیلك.

*- **زیڕیە** : منداڵی ساوا کەزۆر بگریێ ، ئەیان ووت زیڕیەی گرتیە.

*- **زیندەمار** : ئاژەڵ و مەڕو ماڵات.

*- **زویر** : تووڕە بەتایبەتی بۆژنان بەکاردێت، کەتووڕە دەبێت و دەچێتەوە ماڵی باوکی.

*- **زولێ** : کورتکراوەی ناوی (زولەیخاو زولفا) .

*- **زوڕیەت** : منداڵی نێرینە لەدوای مردن جێهێشتن.

*- **زۆڕە زۆڕ** : دەنگی کەرو ئێسترو ماین و وولاخی بەرزە.

*- **زوورگ** : بەرزایی رووتی بێداروبارلە دەشتدا.

*- **زیوێر** : پارچە، وەکوو زیوێرە قوماش.

# ژ

*- **ژان** : ئێش و ئازاری منداڵبوون.

*- **ژانە هویرك** : ژانی ژن لەسەرەتای منداڵبوون.

*- **ژاندن** : هێنان و بردنی مەشکە بەپاڵ پێوەنان و هێنانەوە پێش خۆ.

*- **ژاوەژاو** : دەنگی تێکەڵاوی بۆق لەوەرزی بەهاردا.

*- **ژوار** : ئازاری زۆر، ژانی سەخت.

*- **ژۆری** : لای سەرەوە، وەکوو (بڕۆسەری ژۆری) واتا بڕۆلای سەرەوە.

*- **ژنۆکە** : ژنێکی غەریبی بەستەزمان.وەکوو (ژن هەیەو ژنۆکەش هەیە) .

*- **ژێربەرەژۆر** : لەخوارەوە بۆسەرەوە.

*- **ژێرەو ژۆر** : سەرەو نخوون، قڵپ بوونەوە، کاول بوون.

*- **ژێرسەر** : بالیف، سەرین.

*- **ژێرپیارە** : ژێرپیاڵە.

*- **ژێرچەن** : ژێرچەناگە.

*- **ژیکەلە** : منداڵی پوخت و خنجیلانە.

# س

*- **سارداو** : سەردەمی خۆی هۆیەکانی ئاوساردکردن وەکوو ئێستا نەبوون، بەتایبەتی ئەو گوندانەی کەسەرچاوەو کانی ئاویان لەناوگونددا نەبوو، بەلکوو لەشوێنێکی تربەجۆگا بۆیان دەچوو، شوێنێکیان لەژێر سێبەرێکدا قوولّ دەکردو وەکوو چالێك ئاویان تێدەکرد، سەریان دادەپۆشی بۆرۆژی دواتر ئاوەکە سارد دەبوو و بەکاریان دەهێنا بۆخواردنەوە، ئەم کارە لەهاوینانەدا جێبەجێدەکرا، بەم چاڵە ئاوە دەووترا سارداو.

*- **سارتکە** : گوندێکە لەبناری سەفین لەدۆلی قەلاسنج.

*- **ساردە گیا** : جۆرێکە لە گیای هاوینە، وەکوو بژار لەناوشینایدا دەڕوێ.

*- **سارنج** : شوێنێك لەرادەبەدەر ساردبێ، وەکوو (ئەو جێیە زۆر ساردە دەرێی سارنجە) .

*- **ساختە** : درۆو بوختان، شتێك کەڕەسەن نەبێت.

*- **ساختەچی** : کەسی ناڕاست و فێلباز.

*- **ساغکردنەوە** : رۆشنکردنەوەی شتی نەزانراو، هەروەها فرۆشتنی شتێك.

*- **ساردایی** : هەستکردن بەسەرما، یان ئەگەر هەوالێکی ناخۆش ببیستی ئەلێن (سارداییەك پەیدا بوو) .

*- **ساردوسڕ** : زۆرسارد، زۆر بێ مەیل و ئارەزوو.

*- **ساریج** : شوێنەوارێکی دێرینە لە خوارووی چیای (کلاوقاسم) بەرانبەر گوندی توتمە.

*- **سالح** : پیاوی تۆبەکارو دیندار.

*- **سامتین** : جۆرێکە لەبەن و دەزووی بریقەدار.



*- **سان** : جۆرە بەردێکی پانە بۆ تیژکردنەوەی داس و بیور بەکاردێت.

*- **ساوە** : پشووی دا و حەسایەوە.

*- **سایەقە** : سەرماو سۆڵەو بەستەڵەك.

*- **ساچمە** : ئەو پارچانەی دوای تەقینەوەی گوللەو قونبەلەو تۆپ و هاوەن ساچمەی پێدەڵێن، هەروەها ئەگەر یەکێك پێ لەشتێك بدات و بەریێتەوە ئەڵێن (ساچمەی برد) وەلەهەندێ شوێن ئەڵێن (ساتمەی برد) .

*- **سپیگرە** : گوندێکە لەرۆژهەڵاتی شەقڵاوە.

*- **سپیندارە** : گوندێکە لەبناری هەورێ لەرووی دۆڵی هیران.

*- **سبحەینێ** : سبەینێ ، بەیانی.

*- **سبیانێ** : سبەینێ، رۆژی دادێ.

*- **سپی پات** : ئەسپی سپی خاڵدار.

*- **سوو** : هەم بەمانای سوێ دێت هەم بەمانای گەروو و باسك.

*- **سوێرە** : گوندێکە لەدۆڵی بالیسان و سەربەناحیەی بێتواتەیە.

*- **سوولاوك** : گوندێکە لەبناری سەفین.

*- **سوولاوکە** : ئاوەڕۆی سەربان .

*- **سوانکێ** : ئەو کێشکە (چۆلەکە) یە کەلەئاوەدانیدا لەدەوروبەری مرۆڤ دەژیت، لەبەر ئەوەی هەرلەسەر گوێ سواندانەوەیە بۆیە پێیدەڵێن سوانکی.

*- **سوێ** : لەزۆر گوندی خۆشناوەتی وشەی (سوێ) بەکاردێت، وەکوو (ئەچمە سوێ ی ) یان (چوومە سوێ) وشەی سوێ لێرەدا بەمانای تەماشاکردن و سەیرکردن دێت.

*- **سوسێ** : گوندێکی گەورەی خۆشناوەتیەو سەربە قەزای کۆیەیە، دراوسێی سماقوڵیە.

*- : **سۆری ساقە** : بێچوە باڵندە کەتازە لە هێلکە هاتۆتە دەر.

*- **سۆریازە** : وەکوو (هەندرێشە) وایـە بـەهاران دەڕوێ، لەگـەڵ سـاوارلێیدەنێن، خواردنێکی بەلەزەتە.

*- **سۆبلەتی** : جۆرێکە لە داری گێوژ، بەڵام سۆبلەتی رەنگی سوورەو بەراوە.

*- **سۆتەك** : بەواتای مشکی دێت، وەکوو سۆتەکی جگەرە.

*- سۆل : پێڵاوی پاش پانی پێوەنـەبێ، ئەوانـەی کـەخێرا پێڵاولەپێدەکـەن پـاش پانی دەکەوێتە ژێرپێ، ئەڵێن سۆلانی پێڵاوی لەپێکرد.

*- **سۆفیلکە** : چۆلەکەیەکە سەری بە پۆپیتەیە لەناو دەشتاییەکاندا دەژیت.

*- **سەرئەشکەفتان** : هاوینەهەوارو تاڤگەیەکە لە بێتواتە.

*- **سەرپسێنکە** : بێچووی کەروێشك کە بەتـەواوی گـەورەبوویێ بتـوانێ خـواردن بەخۆی پەیدابکات.

*- **سەرەمر** : بەو مریشکانە دەووترێت کە چەند جارێك جووجکەی هەڵێنابێت.

*- **سـەررەو** : شەوانە رەوە سەگ بەلوورە لوور بەدوای یەکدا دەکـەون، لـەم سـەر بۆئەو سەر رادەکەن، ئەمە سەررەوی پێدەڵێن.

*- **سەرەد** : لەبێژینگ گەورەترە، بۆلەیەك جیاکردنەوەی دانەوێڵەبەکاردێت.

*- **سەردەر** : سەردەرگا.

*- **سەردولکە** : بەمردوو هەڵگۆتن.

*- **سەراگر** : ئاسنێکی سێ گۆشەیە دەخرێتە سـەر ئـاگردان بۆئـەوەی مەنجـەڵ و کتری لەسەر رابوەستێ.

*- **سەراپیتە** : بنمیچی خانوو.

*- **سەرەسـواندە** : ئەو بەشەی سەرەوەی خانووی قـوڕ کەبـەکوتك دەیکوتنـەوە، کەمێك لێژترە لەسەر بان.

*- **سەرینگان** : بەشی سەرەوەی ژوور، لای سەرەوە.

*- **سەمێ** : کورتکراوەی سەمیعە.



* - **سەکەت** : ئەو وولاّخانەی کە گۆشتیان ناخوری وەکوو ئێسترو کەرو بارگیرو ئەسپ و ماین کەدەمرن ئەیان ووت سەکەت بوونە.
* - **سەربار** : ئەو بەشەی بارە کەلە وولاّخ دەنرێت، ئەو بارەی کە دەکەوێتە لای سەرەوە.
* - **سەربار** : چیایەکە کەوتۆتە سەرووی گوندی خەتێ و بەسەرباری خەتێ ناوزەد دەکرێ.
* - **سەردۆر** : سەردۆڵ، گوندێکە سەربەناحیەی سکتان.
* - **سەفەربەلیگ** : سەفەرکردن بەپێ، کاتی خۆی بەریتانیا خەڵکی بەسەربازی لێرەوە بردۆتە هیند بەپێ.
* - **سەروجۆتە** : ئەو گوڵەی یەکەم جار تووتن دەری دەکات.
* - **سەرکەبزۆت** : داری نیوە سوتاوی سەربەئاگر.
* - **سەربەرزق** : بەبەخت، بەشانس و نێوچەوان.
* - **سەرپارە** : پێشەنگی دروێنەکردن.
* - **سەرپەڕ** : بزربوو، وونبوولەمێگەل.
* - **سەرتۆپ** : بێ هاوتا لەجوانی.
* - **سەرتریان** : یەکێك پرچی زۆربێ و بەگورپیزەبێ.
* - **سەرخەوشکاندن** : کەمێك نووستن.
* - **سەردەدونان** : راکردن و غاردان لەدوای شتێك.
* - **سەرشۆرکە** : شوێنی خۆشووشتن.
* - **سەرشین** : ژنی بێ بەخت و پێ ڕەش و شووم.
* - **سەرقرژن** : کەسێ کەمووی سەری تێکەڵ و ئاڵۆز بێت.
* - **سەرقەرەمانە** : هەقدەستی نووشتە نووسین.
* - **سەرکۆت** : سەر ڕووت.
* - **سەرکۆت** : سەربێژینگ لەکاتی گەنم لەبێژینگ دەدرێ.

*- **سەرەمژانە** : دارێکی کورتە لەنێوان نێرو ئاموردا.

*- **سەروکانی** : سەرکانی ، سەرچاوە ی ئاو، ناوی کانیەکە لە خۆشناوەتی.

*- **سەرەدەر** : لێزانین لەکاروباردا.

*- **سەران** : سەرووی لووتکەی چەند شاخێك، وەکوو دەڵێن (هەتاو بەسەران کەوت) .

*- **سەروچاوە** : شارۆچکەیەکە ئێستا بۆتە سەنتەری ناحیەی بێتواتە، یەکەم شوێنە کەسنووری خۆشناوەتی لەرۆژهەلاتەوە دەستپێدەکات.

*- **سەنگۆ** : لەگۆلك گەورەتر ، پێش ئەوەی ببێتە جوانەگا.

*- **سەگسار** : جۆرێکی مەیوون، جۆرە جنێوێکە وەکوو (دەرێی سەگساری) .

*- **سەگایەتی** : فرت وفێڵ و تەڵەکەبازی.

*- **سپیلکە** : گوندێکی زۆر گچکەی سەربەناحیەی بالیسانە، کەوتۆتە نێوان (خەتێ و بێرۆ) .

*- **سماقوڵی** : سێ گوندی خۆشناوەتین و سەربە (کۆیە) ن، (سماقوڵی سەرووچاوە، سماقوڵی گرتك، سماقوڵی گەری) .

*- **ستری** : جۆرە درکێکە، چقڵ.

*- **ستەرك** : وەکوو مێزێکی گەورەی لاکێشە وابوو لەدار درووست دەکرا، کەلوپەلی خواردەمەنیان لەسەر دادەنا.

*- **ستی** : ناوی ژنانەیە، کورتکراوەی ئەستیە.

*- **سمایل** : کورتکراوەی ئیسماعیل.

*- **سمە** : کورتکراوەی ئیسماعیل.

*- **سمۆ** : کورتکراوەی ئیسماعیل.

*- **سمرکە** : جۆرێکە لەگیای هاوینان ، وەکوو بژار لەناو کشتوکاڵدا دەڕوێ، رەنگی بۆرە.

*- **سریشك** : وەکوو گۆزە وابوو رۆنە کەرەیان تێدەکرد.

*- **سر** : بۆ ئەو گیانلەبەرانە بەکاردێت کە رادەکەن لەمرۆڤ و دەستەمۆنین، هەرکاتێك مرۆڤ بچێتە لایان ئەوان هەڵدێن.

*- **سڕ** : دەست و پێ تەزیو بەهۆی سەرما.

*- **سڕبردی** : سەرما بردی.

*- **سیپارە** : یەکەم کتێبەکەی فەقێیان، کە پیتەکانی عەرەبی تیادا بەدەست نووسراونەتەوەو مەلا بەپەلە زلێك پیتەکان پیشانی فەقێ دەدات و ئەویش لەدوای دەڵێتەوە.

*- **سیساوە** : گوندێکی گەورەی خۆشناوەتیە، سەربە ناحیەی هەریرەو کەوتۆتە سەر رێگای شەقڵاوە هەریر.

*- **سیسارکە کەچەر** : جۆرێکە لەهەڵۆو باز.

*- **سیوسیوە** : دارێکی کورتە، چاك دەکرا ، هەم دەچێتە ناو کونی باگردان، لایەکەی تریشی دەچێتە ناو دەسکە باگردان.

*- **سێ درانکە** : جۆرە دڕکێکی گیایی یە، لەناو گەنم و جۆدا بەهاران شین دەبێ.

*- **سێبسکۆرە** : گیایەکی بەهاریە، سێ کەد دەردەکات، سەرکەدەکان زەردە لەگەڵ ساواردا دەکرێتە چێشت .

*- **سکورد** : مل، شان.

*- **سمین** : کونکردن، کونکردنی گوێ و ئامادەکردنی بۆ گوارە تێکردن.

*- **سمتراش** : ئەو ئامێرەی ناڵبەند بەکاری دێنێ بۆبڕینی سمی وولاخ.

*- **سلێرك** : گیایەکی بەهاریە وەکوو کاردی وایە، بەخۆڕسکی لەچیاکان دەڕوێ، هەرچەندە بۆنی هەندێك ناخۆشە، بەڵام دوای کوڵاندن بۆنەکەی نامێنێ، لەگەڵ هێلکە تێکەڵی دەکەن، وەلەگەل ساواریش لێیدەنێن، هەروەها سلێرك بەری (گوێنیە) کەلەکوێستانەکاندا هەیە، کەتیرەیەك دەردەکات سلێرکی پێدەڵێن، جاران وەکوو سیکۆتین بۆ بەرگکردنی کتێب بەکاریان دەهێنا.

*- **سێنان** : گوندێکە لەدۆڵی سماقوڵی.

*- **سناوە** : گوندێکە لەسنووری ناحیەی سکتان.

*- سندم : لەئاسن دروست دەکرێ، وەکوو دوو تۆق وایە لەهەردوو لاقی پێشەوەی وولاخ دەکرێ، بۆئەوەی بەرەڵلا نەبێ، بەکلیل دادەخرێ.

*- **سوختە** : قۆناغی خوێندنی سەرەتایی فەقێیایەتی.

*- **سوغرە** : ئیش پێکردنی بەزۆری و بێ کرێ.

*- **سوڕبەسوڕ** : بەئاشکراو بەدڵنیایی (سوڕبە سوڕ ئەزانم ئەو قسەیە درۆیە ) .

*- سۆرك : جۆرێکە لەهەرمێ.

*- **سۆرك** : ئەو گردەی کەوتۆتە بەرانبەر شەقڵاوە.

*- **سۆرکە** : سۆریکە، سوریژە.

*- **سۆرکەرە** : رەنگی سووری ناتەواو.

*- **سۆرەپەل** : گەڵای ووشك بووی تووتن کەلە ژێرەوە ووشك بووە.

*- سۆری شامی : جۆرێکە لەترێ.

*- **سوورسوورە** : گوندێکی خۆشناوەتیە لە دەشتی هەریر.

*- **سۆتکە** : گیایەکە بۆدەرمان بەکاردێ.

*- **سۆتەکە** : گیایەکە لەناو ژاژی دەکرێ.

## ش

*- **شایی پێهاتن** : ئەم رستەیە زۆربەکاردێت لەگوندەکانی خۆشـناوەتی، بـەواتای کەیف پێهاتن و دڵپێخۆشبوونژدێت، وەکوو دەڵێن (دەڵێی گەڕێن بائـەو ئیشـە بکات شایی پێدیّ) .

*- شادە : باوەڕهێنان بەخواو پێغەمبەر، شایەتی.

*- **شادەنوێژ** : پەنجەی دووەمی دەستی راست.

*- **شاگەشکە** : بوورانەوە لەخۆشیان.

*- **شاخی سۆر** : چیایەکە لەنزیك (کلاّوقاسم) .

*- **شاخی عەوشێ** : چایەیەکە لەنزیك شاخی سـوور.

*- **شاقەل** : دامێنی کەوای مەلایان ، (شاقەلان دەبەر پشتی بنێوە) .

*- **شوان خافرێنکە** : باڵندەیەکە هێندەی کۆتر دەبێت زۆر دوور نافڕێت.

*- **شوانکارە** : بەخێوکردنی مەڕومالاّت بەنیوەیی.

*- **شوارك** : قەدی باریکی هەنارو هەنجیرو بی و ئەسپیندار.

*- **شرار** : ئەم زاراوەیە چەند واتایەکی هەیە وەکوو :

یەکەم : دروونی جلوبەرگ بەدەست، بێئەوەی قوماشەکە بنووشتێننەوە دەیدروون.

دووەم : ئەڵێن ئەوەندەی لێدا شراریان کرد ، واتا کەوت و راکشا.

سێیەم : ئەگەر یەکێك زوو خەوی لێبکەویّ و ماندوو بیّ، ئـەڵێن شـرار بـوو، واتـا ئەوەندە ماندوو بووە زوو خەوی لێکەوت.

*- **شووتەتیان** : ئەم زاراوەیە لەهەندیّ گوندی سـەریەناحیەی بێتواتـە بـەکاردیّ، بەمانای شوشتوویانە.

*- **شکەلك** : پان و بەرین، وەکوو (دەوی هەندی گەورەیە دەرێی شکەلکە) .
*- **شکر** : وێنە، نیگار.
*- **شکێرکە** : جۆرە ئەستورکێکە لەئاردەساوار دروست دەکرێت، هەندێ روون لەسەر سێلێ دادەنێن و پاشان هەویرە شلەکە لەسەر رۆنەکە پان دەکەنەوە و خواردنێکی بەلەزەتە ، شلکێنە.
*- **شرۆنی** : تەرۆزی دوای ئەوەی دەبێتە کالیار، ئەگەر کالیارەکە زۆر بووبی ئەوا پێی دەڵێن شرۆنی بووە ، واتا زۆربووە.
*- **شەلەگە** : پلاوی ئاو، شوێنی ئاو هەڵبەستن لەجۆگا، بۆسەر شینایی.
*- **شەقە** : پارچەیەك زەوی بەراو کە کرابێتە کشتوکاڵ، لەچەند بەنداوێك پێك دێت.
*- **شەکرۆك** : جۆرێکە لە درِك، بەهاران دەڕوێ ، زۆربەرز دەبێت ، سەرەکەی خڕەو بەدرِك دەورە دراوە ، دوای لێکردنەوەی درِکەکان ناوکەکەی دەخورێ.هەروەها بەرزاییەکە لەنزیك گوندی شێخ مەموودیان.
*- **شەخصیان** : چەن ماڵێکن لەنزیك هیران.
*- **شێخ وەسانان** گوندێکە سەربەناحیەی بالیسان ، یەکەم شوێن کەچەکی کیمیایی تیادا تاقیکرایەوە لەگەڵ بالیسان.
*- **شیرە** : دوو گوندن (شیرەی سەروو و خواروو) لەناحیەی بالیسان.
*- **شیرتێن** : ئاوی کەمێك وەکوڵ هاتوو.
*- **شیشار** : بەرزاییەکە لە نزیك بێتواتە.
*- **شۆپە** : چیایەکە کەوتۆتە سەرووی گوندەکانی شێخ وەسان و خەتێ و توتمە.
*- **شۆغەر** : لای سەرەوەی قەدی دار کەتازە گەڵا دەردەکات ، (دار تازە شۆغەری دەرکردینە) .
*- **شکارتە** : بەواتای گەنم و جۆکردن دێت، واتا ئەو کاتەی کە نەدوراوەتەوە. (پارچە شکارتەکی باشم داچاندیە) .
*- **شکارتە** : گوندێکە لەنزیك بێتواتە.



*- **شیخ مەمموودیان** : گوندێکە سەربەناحیەی باسرمەیە.
*- **شرێمك** : گوندیك بوو لەرۆژئاوای بالیسان، ئێستا بۆتە گەڕەکێکی ناحیە.
*- **شەوی** : ئێواران ئاویان لەناو کوندەو لوولکەو دێمکە هەڵدەگرت هاوینان ، بۆ رۆژی دواتر بەکاریان دەهێنا بۆخواردنەوە، فێنکی و ساردی تاکوو نزیکی نیوەڕۆ دەما، بەم ئاوەیان دەووت شەوی ، وە خواردەمەنی ئێواران بۆیەیانی شەوی پێدەڵێن .
*- **شەواو** : ئەوانەی باخچەی گەورەیان هەیە، شەواویان هەیە، شەواو بریتی بوو لە هەڵبەستنی ئاو لەئێوارەوە تاکوو بەیانی ، کەس بۆی نەبوو ئاوەکە ببڕێ ، ئەمە بەشەواو ناوزەد دەکرێت.
*- **شەوێ دی** : شەوی رابردوو.
*- شەوادی : دوێنێ شەو.
*- **شەوترادی** : پێرێ شەو.
*- **شەو** کۆر : ئەوانەی بەشەو هیچ نابینن و بەرۆژ ئاساین.
*- **شەوین** : خاوەن مێگەلە مەڕو بزنەکان هەندێ جار بەشەو واتا پێشی بەیانی مەڕو مالآت دەبەنە لەوەڕگا بۆلەوەڕاندن.بەمە دەڵێن شەوین.
*- **شەوگەڕ** : بەمانای ئەوانەی شەو دەگەڕێن.
*- **شەرە** : جۆرێکە لەهەنجیر، رەنگیان مۆرەو زۆربەتامن.
*- **شەمووس** : ئەو وولآخانەی کەزۆر سرن و نایەڵن باربکرێن.
*- **شتۆ** : کامە، کیهە.
*- **شتۆکە** : شتی گچکە.
*- **شرتوشۆ** : بەفر کە دەتوێتەوە یان باران لێی دەدات زۆر شل دەبێ.
*- **شرینگە** : یەکێك کەباران و بەفر لێیدابێ و زۆرتەڕ بووبێ، وەکوو (هەندی باران وێکەتیە شرینگەی لێدێ.) .
*- **شرێوە** : شڵێوە، پێش بارینی بەفر دەبارێ ، نەرمەو بەرایەخی بەفر دەژمێررێت

## ع

*- **عارد** : زەوی.

*- **عاجووج** و باجووج : یەئجووج و مەئجووج.

*- **عاجباتی** : سەیروسەمەرە.

*- **عازەب** : لە (اعزب) عەرەبیەوە وەرگیراوە، لاوی تازە پێگەیشتوو.

*- **عاللاوە** : گوندێکە لەدۆڵی قەڵاسنج.

*- **عاستەم** و دووبەرا : زۆر نزیك .

*- **عاسمان** : ئاسمان.

*- **عاشتەبا** : هیچ شتێك، هەرچی هەبوو، وەکوو (ئاگری لەمارێ بەربوو عاشتەبای دەرنەچوو) .

*- **عاملان** : راهاتن ، فێربوون.

*- **عاملاندن** : راهێنان ، فێرکردن، بەخێوکردن.

*- **عاملاو** : راهێندراو، فێرکراو.

*- **عان** : کات، سات، وەخت ، دەم.

*- **عانە** : دراوێکی کۆن بوو، لەفلس کەمتربوو.

*- **عەمبارۆز** : هێرشکردنەسەر، پەلاماردان.

*- **عەزیمەت** : ئەو کەسانەی کەشێت دەبوون یان باری دەروونیان تێك دەچوو، دەیانبردنە لای ماڵە شێخەکان، بۆدەرکردنی جنۆکە لەسەری نەخۆشەکە قاپێکی گەورەی لەماددەی سفر ، هەندێ ئاویان تێدەکرد و چەند ئایەتێك و

نزاو پاڕانەوەیەکیان لەسەر ئاوەکە دەخوێند بەسەر نەخۆشەکەیاندا دەکرد، بەمە دەووترا عەزیمەتیان لۆگرتەوە.

*- **عەبدۆ** : کورتکراوەی ناوی (عبدالرحمن) ە.

*- **عەدۆ** : کورتکراوەی ناوی (عبدالله) یە.

*- **عەولا** : هەمان مانا.

*- **عەدیلە** : کورتکراوەی ناوی (عبدالرحمن) ە.

*- **عەبۆ** : کورتکراوەی ناوی عبدالله یە.

*- **عەز** : حەز، تاسە، ئارەزوو.

*- **عەزۆ** : سووککردنی ناوی عەزیز.

*- **عەلۆ** : سووککردنی ناوی عەلی.

*- **عەلکە** : سووککردنی ناوی عەلی.

*- **عەمبەر** : ناوی ژنانەیە.

*- **عەمبەربۆ** : برنجی بۆنداری بۆن خۆش.

*- **عەشتەبا** : بەواتای هیچ شتێك، وەکوو دەڵێن ئەو پیاوە ماڵی سووتا ، عەشتەبای دەرنەچوو.

*- **عەدەبخانە** : بەواتای ئاودەست.

*- **عەنەتریك** : لایت.

*- **عەینەن** : هەروەکوو .

*- **عەمبارەسۆتی** : نارەسەن، یان ئەو قوماشانەی کەوا زوو تێك دەچن و هەڵدەوەرێن.

*- **عەلیاوا** : گوندێکە کەوتۆتە باکووری ناحیەی دێگەڵە.

*- **عرووس** : کاتی خۆی بە سوپای رووسیا دەووترا.

*- **عووعە** : وشەی ترساندنی منداڵ، بەواتای گورگ دێ.

*- **عومەمرۆکە** : عومەری ماڵوێرانی بەدبەخت.

# غ

*- **غاردان** : راکردن.

*- **غارب** : زۆربە، زۆرینە.

*- **غارب** بوون : بەسەردا زاڵبوون، وەکوو (چوومە جێیەکی ترسم بەسەردا غارب بوو) .

*- **غلوور** : لەخۆبایی ، هاربوون، یەکێك لەپێستی خۆی چووبێتە دەرەوە.

*- **غلۆر** : یەکێك لەشوێنێکی بەرز بێتە خوارەوە، یان هەرشتێك لەبەرزایی بێتە خوارەوە.

*- **غەرە** : ئەو بەردانەی لەدەورەی گۆڕوپیاوچاکان وەکوو چیل و دیواردانراون.

*- **غەرەز** : رق و کینە، مەبەست و نیاز.

*- **غەرێفە** : وەکوو سەبەتە لە شوو دروست دەکری ، بەڵام درێژەو بە زبڵ سواخی دەدەن و هەنگی تێدەکەن.

*- **غەزرین** : هەم بۆمرۆڤ و هەم بۆ وولاخیش بەکاردێت ، بەواتای یاخی بوون دێت.

# ف

*- **فابریقە** : کارگە، کارخانە.

*- **فات‌اوە** : گوندێکە لەدەشتی هەریر.

*- **فات** : کورتکراوەی فاتیمە.

*- **فاتیلە** : فاتیمە گچکەی منداڵ.

*- **فاتیلێ** : فاتیمەی رەزا شیرین.

*- **فاتم** : کورتکراوەی فاتیمە.

*- **فاتمەسۆر** : ناوی فاتیمەبێ و پرچی سووربێ.

*- **فاتەبۆر** : فاتیمەی رەنگ بۆرەکە.

*- **فاتمرەش** : سپڵ.

*- **فاتێ** : بۆبانگکردنی فاتیمە.

*- **فاتمۆك** : هەمان واتا.

*- **فاتمۆکێ** : هەمان واتا.

*- **فاتمیلێ** : هەمان واتا.

*- **فامکردن** : گەورەبوونی منداڵ و تێگەیشتن لە شت.

*- **فت** : کۆم.

*- **فتەفت** : چرپە چرپ،

*- **فججور** : دەنگی فڕینی کەو، خۆفڕێدان.

*- **فرچك** : یەکەم شیرخواردنی کارویەرخ و گیانلەبەرانی تر.

*- **فەراژی** : گەورەبوون و پێگەیشتن، بەتایبەتی کاروبەرخ کەگەورەدەبن دەڵێن فەراژی بووینە، شتڵیش کە گەورەدەبن هەمان شتیان پێدەڵێن.

*- **فەرمەسۆن** : لەدین وەرگەڕاو، بێدین، ناموسڵمان.

*- **فەتەرات** : کارەسات.

*- **فزە** : دەنگ، یەکێك بیەوێ ئەوەی تر بێدەنگ بکات، ئەڵێ فززەی نەکەی ها!.

*- **فران** و **فیسار** : ئەوو ئەمی نادیار.

*- **فرت** و **هۆڕ** : هاتنوو چوونی بەپەلەو بێئەنجام.

*- **فرۆتن** : فرۆشتن.

*- **فرۆتەنی** : شتێك دابنێی بۆفرۆشتن، واتا خستنەروو.

*- **فرۆتی** : فرۆشتی.

*- **فرووجاو** : چەلاوی جوچکەی مریشك کە کەمێك گەورەبوونە.

*- **فرۆ** : ژەك، یەکەم جارکەبزن و مەڕو مانگا دەزێن شیرەکەیان نابێتە ماست بەڵکوو پەیت دەبێ و دەبێتە فرۆ.

*- **فرتەفرت** : قسەی بێکەلك ، فەرمانیشە بۆبێدەنگ کردن، دەفرتەفرتێ مەکە!.

*- **فندەق** : دارلاستیك.

*- **فنەفن** : بۆڵەو پرتەی ژێر لێوان.

*- **فەتاح پاشا** : جۆرێك بوولە قوماشی پیاوان.

*- **فەرتەنە** : ئاژاوەو پشێوی، لەفیتنەوە هاتووە.

*- **فەریك** : میوەی پێنەگەیشتوو.

*- **فیفیتۆك** : ئامرازی فیتەلێدان بۆمنداڵێن.

*- **فیشەکدان** : ئەو رەختەیەی کەلە پشتدا قایم دەکرێ و فیشەکی تیادا هەڵدەگیرێ.

*- فنکە فنك : دەنگ لە لووت هاتن، گریانێك کەبە نووزەوە بێت.

# ق

*- قاچەك : لاتەنیشتێكی ماڵ.

*- قاقیٚ : بەواتای گوێزو هێلكە دێت، ئەم زاراوەیە بۆمنداڵیٚن بەكاردێت،

*- قاقۆز : جۆرێكە لـەگیای بـەهاران ، وەكـوو سـێو بـن عـارد وایـە، بنەكـەی هەڵدەكەنرێت و دوای لێكردنەوەی پەلكەكەی دەخورێت زۆربەتامە.

*- قاپقاپ : نەعلی لەدار دروستكراو.

*- قادیانە : گوندێكە لەدەشتی هەریر.

*- قادرۆك : بۆ زەلیلكردنی قادر بەكاردێت.

*- قادۆ : سوككراوەی قادر.

*- قاوەرتی : قاوەڵتی، نانی نێوان بەیانی و نیوەڕۆ.

*- قاپێلك : بەمانای بەرگ دێت، یان سـەربەكاردێت، بـەرگی كیسـەڵ قـاپێلكی پێدەڵێن، هەندیٚ جاریش بۆسەر بەكاردێت وەكوو دەڵێن (قاپێلكە ستوور) واتـا سەرگەورە یان سەركە ستوور.

*- قاتۆلك : لەوەرزی پاییزدا دوای لێكردنەوەی گەڵای توتن، ئەوەی جێـدەمینیٚ قاتۆلكی پێدەڵێن، نـەك تـەنها بۆتـوتن بـەكاردێت ، تەماتـەو گوڵەبـەڕۆژەو باینجان ...هتد ئەوانیش ئەوەی جێدەمینیٚ قاتۆلكی پێدەڵێن.

*- قاندان : وازلێهێنان، وەكوو ئەڵیٚ (ئەو جارەت قان دەدەم) واتە ئەو جارە وازت لێدەهێنم ، بەڵام جارێكی تر قانت نادەم.

*- **قانگ** : شوێنێك كە دووكەڵی زۆر لێبیٚ .

*- **قانگەلاچک** : دوای ئەوەی کەنگر بەسەردەچێت و گەڵاکەی بەرز دەبێت و زەرد دەبێت و دوایی ووشك دەبێت ، قانگە لاچکی پێدەڵێن.

*- **قارە** : ئەو کەسەی کە دەکەوێتە دوایین کەس لەیاری کردن.

*- **قارنان** : چردۆ، رەزیل، قرولەجەر.

*- **قارەقار** : دەنگی بزن و مەڕ.

*- قاقا : گوندێکە لەسنووری ناحیەی سکتان.

*- **قوتۆ** : بەو سەگە دەووترێت براین و گوێکانی گچکە بێت.

*- **قورکێش** : پارچە تەنەکەیەك لەدوودارەدەبەسترا بۆهێنان و بردنی قوڕ.

*- **قۆرنج** : یەکێك دەمارەکانی پشتی بێشێ.

*- **قۆرنج** شکێن : ئەوانەی شارەزان بۆ شێلان و شکاندنی قۆرنج.

*- **قونجرکە** : جۆرێکە لەدڕك.

*- **قونجرکە** : بەدوونینۆك گرتنی شوێنی ران یان ملی یەکێکی ترو لێرەبادان.

*- **قوراو** : خواردنێکی کۆنی کوردەواریە، زیاتر رەوەندو کۆچەریەکان لێیـدەنێن، بریتیە لە کوڵاندنی گۆشت، ئنجا ماستی تێدەکەن و هەندێ جاترەو بەهارات و نێرکە پیازی تێدەکەن ، بریتیە لە خۆشترین و بەتامترین خواردن.

*- **قلیم قاز** : منداڵ دانان لەسەر مل، قەڵاندۆشك.

*- **قدیلە** : ختۆکە.

*- **قرچوهۆر** : دەنگی سووتانی چەوری لەسەرئاگر.

*- **قرقرتۆك** : قورقوراگە، سورینچك.

*- **قورەپەست** : بریتیە لە گرتنەوەی قوڕو لەجیاتی خۆڵەبانکردنی خـانوو ، ئـەو قوڕەی لێدەدەن، بەتایبەتی ئەو خانوانـەی کەدەیانـەوێ بیکـەن بـەدوو قـات، لەقاتی یەکەم بەقوڕ دایدەپۆشن.

*- **قووپ** : بەرزایی لەزنجیرە شاخ.

*- **قوت** : بزنی گوێ بچووك.



*- **قوچ** : بەرزکردنەوە.

*- **قوچەك** : دانانی چەند بەردێك لەسەر یەك، نیشانەیە کەئەو شوێنەموڵکی کەسێکە، یان بۆ ئەوە بەکاردێت لەسەر جۆگەی ئاو دایدەنێن، نیشانەیە بۆئەوەی کەئاوەکە هەڵبەستراوە.

*- **قولمات** : بۆدەنگ بەکار دێت، قولماتێ نەکەی، واتا دەنگێ نەکەی، لەهەندێ شوێنیش (قورمین) بەکاردێنن.

*- **قوون بەگێچەر** : یەکێك لەهەرشوێنێك گێچەڵی لەدواوەبێ.

*- **قەرەمکردن** : چاکردن و کورتکردنی ردێن و هەڵکەندنی موو، قەرەمکردنیان پێدەگووت.

*- **قەیلوولە** : وشەیەکی عەرەبیەو هاتۆتە ناو زاراوەکانی خۆشناوەتی، نووستنی پێش نیوەڕۆ قەیلولەیە، فەرموودەی پێغەمبەری لەسەرە کەکاتێکی گونجاوو پرخێرە بۆنووستن.

*- **قەیمەسی** : بەرەبابێك و تیرەیەکی گەورەن لەخۆشناوەتی دەژین.

*- **قەراسنج** : قەڵاسنج دوو گوندی خۆشناوەتین لەبناری سەفین.

*- **قەرس بوون** : تووڕەبوون.

*- **قەرەمەستری** : بەجۆرێك لەدڕك دەووترێت.

*- **قەرامستانە** : بەواتای یاری کەرامستانە دێت.

*- **قەمامە** : دوورینێکی کەم.

*- **قەراستە** : پەتێکە یان زنجیرێکە بۆ بەستنەوەی وولاخی بار لەسەری دەئالێنن، هەم بۆ راکێشان و هەم بۆ بەستنەوە بەکار دێت.

*- **قەرپ** : خراپ، یەکێك کرداری جوان نەبێت.

*- **قەرس** : ئازارپێگەیشتن، یان بەشتێك تووڕەبوون.

*- **قەرات قەراتانە** : یاریەکی کۆنی خۆشناوەتیە، چەند کەسێك لەسەر شوێنێکی بەرز رادەوەستن بەهێزی شان یەکتر پاڵ دەنێن بۆ دەرکردنی یەکتر لە شوێنە بەرزەکە ، ئەوەی دەمێنێتەوە لەسەر بەرزاییەکە براوەیە.

*- قەلەبەرخۆرە : باڵندەیەکە هێندەی کۆتر دەبێت، هەم لەچیا هەم لە ناو باخچەکاندا دەژیێت، ئەڵێن ئەتوانێ بە حەوت جۆر دەنگ دەنگی خۆی بگۆڕێ.

*- **قەپۆز** : کورتانی وولاخ ئەو بەرزاییەی پێشەوە بەقەپۆز ناودەبرێت.وەلەهەندێ شوێن (قەلپووز) ی پێدەڵێن.

*- **قەلۆك** : قەلۆك بەهاران شین دەبێ لەناو زەویەکانی کەپارساڵ کرابوون بە شینایی، وەکوو لۆبیو فاسۆلیاو قەلیە دەردەکات، شتێکی بەلەزەتە، چەندجۆرێکی هەیە، وەکوو (قەلۆك گاگۆز، قەلۆك خاتوون، قەلۆك مار....هتد) .

*- **قەری**، پاییزان دوای سەربڕینی گیسکە دابەستی ، هەندێ لەگۆشت سووردەکرێتەوە ولەمەنجەڵی تایبەتدا هەڵدەگیرێ بۆوەرزی زستان ، هەم لەجیاتی رۆن بەکاردەهات و لەناو چێشتیان دەکرد، هەم هیچ خواردنێکیش بێ گۆشت نەدەبوو، لەهەندێ شوێن (قەلی) ی پێدەڵێن.

*- **قەپوچکە** : کڵاوی بەڕوو.

*- **قەسنی** : دەرمانێك بوو بۆمنداڵی ساوا بەکاردەهات ، ئەو منداڵەی کەزۆر دەگریا، لەچەند رووەکێك دروست دەکرا.

*- **قجیلە** : جۆرێکە لەو گیایانەی کەهەرلە پاییزاندا لەناو ئەو زەویانە شین دەبێ کەکراوەنەتە شینایی، دوای کوڵاندن بەسرکە لێدەنرێت وەکوو (تۆڵکە) وایە، لەهەندێ شوێن (گیاپەرچێوە) ی پێدەڵێن.

*- **قۆڕ** : شتی نابەجێ، هەروەها ئەوانەی گونیان زۆر گەورەیە.

*- **قورتەلاس** : گوندێکە لەدۆڵی عەلیاوە.



*- **قورنیچك** : بەهەمان شێوەدێت.

*- **قولـەتێن** : ئـــەم زاراوەیـــە تایبەتـــە بەخۆشـــناوەتی، هەرچـــەندە وشـــەکە عەرەبیەبەواتای ئاوێکی کەم دێت، بەڵام لەلای ئێمە بەو مانایە نیـە، بـەڵکوو دروستکردنی پەرژینێك لەدەورەی ئاوێکی ڕۆیشتوو واتا لەسەر جۆگایەکی ئاو، کەئەو جۆگەیە بەبەردەوامی ئاوی پیادا بڕوا، وەکوو گـۆمێکی بچـووك ، هـەم ئاوی بۆ بچێ و لەلایەکی تریش بچێتە دەرەوە، وەکوو حـەمامێك وایـە، هـەم بۆخۆشووشتن و هەم بۆ شووشتنی جل و بەرگ و قاپ شووشتن، قولەتێن تـەنها هاوینان دروست دەکرێت ، ئەوانەی کەوا ماڵیـان دەبەنـە نـاو کـەپر قولـەتێن دروست دەکەن.جگە لەمەش ژنان نوێژیشی لێ دەکەن.

*- **قوپك** : بەرزایی سەر ترۆپکی شاخ.

*- **قۆپەن** : چەپك، دەسك.

*- **قۆدی** : ئەم زاراوەیە بـۆدوو مەبەسـت بـەکاردێت، یەکـەم بـەواتای قووتـوو، دووەمیش بەرانبەر بە ئاوێنە جاران بەکاردەهات.

*- **قنووت** : ئەم وشەیە لەزمانی عەرەبیەوە هـاتووە، بـەیانیان دوعـای قنـووت لەناو نوێژدا دەخوێنـدرێت، هـەروەها هـەمان زاراوە لەهەنـدێ گونـد بـەنانی چێشتەنگاو دەووترێت، بەیانیان دوای پشوێك کارکردن جەمێك نان دەخورێـت، لەهەندێ شوێن بەنانی چێشـتەنگاو بەناویانگـە لەهەنـدێ شـوێنیش قنـووتی پێدەڵێن.

*- **قیرژە** : گوندێکی خۆشناوەتیە.

# ك

*- **کا؟** : کوا لەکوێیە؟

*- **کا بینە** : کوا بیهێنە.

*- **کالەکێیە؟** : کوا لەکوێیە؟.

*- **کاچویت** : هیچیان دەرنەچوون، بۆکارەساتێك دێت کەبەسەرخێزانێکدا بێت و کەسیان دەرنەچێ، ئەڵێن کاچویتیان لێبڕا.

*- **کارتیخ** : بۆ تیژکردنەوەی داس و بیورو چەقۆ بەکاردێت، سمپارە.

*- **کاوەخۆ** : بەهێمنی، لەسەرخۆ، زۆر هێور.

*- **کانی** : کوا لەکوێیە؟.

*- **کارەیی** : یەکێك ئەگەر زۆر خێرابێ لە خواردن و کارکردندا .

*- **کاکیلە** : براگیان ، کاکەگیان.

*- **کاکیلە** : ددانی خڕێنە ئەوەی لای پشتەوە.

*- **کاکۆ** : براگیان، خوشك بۆبرا گەورە بەکاری دێنن، هەروەها براژنیش بەبرای مێرد دەڵێت کاکۆ.

*- **کاکوت** : ئەو ئامێرەی کا دەکووتێ.

*- **کارخانچی** : پیاوی بە فرت و فێڵ.

*- **کارەکەگا** : پێڵاوی لە پێستی ئاژەڵ دروستکراو، بۆرۆیشتنی سەربەفر زستانان بەکاریان دەهێنا.

*- **کارەموو** : مووی پەشتراو و تەنراو لەمووی کار.

*- کارەوان : شوانی کاریلە.

*- **کافرستانی** : بەزەیی نەهاتنەوەبە لێقەوماوان و هەژاران.

❊- **کاردی شاخی** : ئەو کاردیەیە کەلەشاخ دەڕوێ.

❊- **کاردی قوڕێ** : ئەو کاردیەیە کەلە دەشتا دەڕوێ و گەلێك زۆرە.

❊- **کاردی ریشۆری** : ئەو کاردیەیە کەزۆر رەواجی لەسەرەو بەهاران زوو دەفرۆشرێ.

❊- **کاڕك** : بە بەرووبوومی نەگەیو دەووترێت، وەکوو (کاڕکە گەراز، کاڕکە سێو، کاڕکە گندۆرە...هتد) .

❊- **کادین** : شوێنی تێکردنی کا بۆوەرزی زستان.

❊- **کاموسەك** : گوندێکە لەدۆڵی هیران.

❊- **کاڕووش** : جۆرێکە لەگیا، رەگی لەزەویدا پەرت و بڵاو دەبن و کشتوکاڵ لاواز دەکات.

❊- **کاوانیان** : گوندێکە لەرۆژئاوای شەقڵاوە.

❊- **کاژێر** : بۆشتی گەورە بەکاردێت ، وەکوو کاژێرە ستوور ، واتا سەرگەورە.

❊- **کانی** بەرد : گوندێکە لەسەرووی بالیسان.

❊- **کانی** بی : گوندێکە لەدۆڵی عەلیاوە.

❊- **کارتە** : قەدی نوێ ی دارو تووتن.

❊- **کۆپەران** : بۆجووتکردن بەگاو وولاخ بەکاردێت.

❊- **کۆرەمار** : ماری بۆرەی سەرسێ سووچی ژەهردار.

❊- **کوڕیژگە** : منداڵی کوڕی گچکە.

❊- **کۆریس** : ئەو بزنانەی کە قۆچ و شاخیان نیە.

❊- **کورژنی** گریان : گریانی بەدەنگی بەرز.

❊- **کوندەران** : ئەو کەپرەی یان ئەو شوێنەی کە کوندەی ئاویان لێدادەنا بۆئەوەی ئاوەکە گەرم نەبێ.

❊- کەپووقەلانگ : کەپوو درێژوخوار، لووت درێژ.

❊- **کەترە** : بزن و مەڕی نەخۆش ، کەلەدوایی مێگەلدا دەڕۆن.

❊- **کەچە** : کۆنەو بێبایەخ.

*- **کەحلان** : ئەسپی باش.
*- **کەرانە** : ئەو پارەیەی کەلە پەشیمان بوونەوە لەسەودایەك دا دەدرێ.
*- **کەرۆکە** : بێئەقڵ و گێلۆکە.
*- **کەلام** : فەرموودە، ئاخاوتنی کەسانی بەڕێزو حورمەت (کەلامت بە شەکربی) .
*- **کەوری نانی** : ئەو پارچە پێستەیە کە خۆشکراوە بۆ ئەوەی ئاردو هەویری لەسەردابنێن.
*- **کەوەت** : جۆرە دارێکە.
*- **کەونینە** : زۆرکۆن و مێژوویی.
*- **کسۆك** : سەگ.
*- **کورکە حەرامە** : بێچووی باڵندە یەکەم جار توکێك دەردەکات رەنگی زەردە، کورکە حەرامەی پێدەڵێن.
*- **کەچە** : بۆشتێکی خراپبوو، وەکوو کەچە لێف، کەچە گوش...هتد.
*- **کوتکە کۆر** : یەکێك چاوی کەمبین بێ.
*- **کخ** : بۆترساندنی منداڵ کە شتی پیس نەخوا، واتا پیسە.
*- **کەڕەکیفە** : شتێك کە کەڕوو لێیدابێ یان پشوو بووبێ.
*- **کەسك** و سۆر : کۆلکە زێڕینە.
*- **کربە** : بێدەنگبە، ووسبە.
*- **کرۆژ** : گوندێکە لەدۆڵی سماقوڵی.
*- **کزر** : کەمێك ووشك بووبێ.
*- **کووزی** : پارچەیك، قاشێك، کەرتێك، وەکوو کووزیە خیار، کووزیە گندۆرە، کووزیە شفتی.
*- **کەمەرە** : وشەیەکی زۆرکۆنی کوردەوارییە، لەخۆشناوەتی زۆربەکاردێت، بەمانای رەفە دێت، چەند سینگی دار یان ئاسن لەدیواردەکوتن و تەختە دارێکیان لەسەردادەنا و کەلوپەلیان لەسەردادەنا.



*- کەربەش : جۆریکە لەگیا ، جۆرە بژاریکە لەناو گەنم و جۆدا شین دەبیٚ.

*- کەرِەنگر : گەلاٚ یان پەلکی داربەرِوو، کەپایزان دەوەریٚ لەژێردارەکە دەکەویتە سەریەك و ووشك دەبیٚ، ئەو چرۆیە ووشکە کەرِەنگری پیدەلێن.

*- **کەتمانە جۆتانە** : دوو کەس بەرانبەر یەکترهەریەکە دەستیك دەبەنەوە پشت خۆیان ، یەکیك دەی گووت من جووت، ئەوەی تریش ئەی ووت منیش تاك، هەریەکە دەستی خۆی دەهێنایە پیشەوەو هەریەکە چەند پەنجەیەکی دەقوچاند هەندیکیشیان بەرز دەکردەوە، ئەگەر پەنجەکان جووت بانە ئەوا ئەوەی ووتبووی من جووت ئەو دەیبردەوە، وەبە پیچەوانەشەوە، ئەمە بۆدەستپیکردنی یاریەك بوو یان ئیشیك، کەکامە پیش ئەوەی تر دەست بەیاریەکە بکات.

*- **کەڵەپەز** : جۆبرِکە، قزبرِکە.ووڵە.

*- **کەوەرتیان** : گوندیکە سەربەقەزای شەقلاٚوە.

*- **کەوەرِیٚ** : کەسیك کەزۆر ئیش بکات و ماندوو بیت، ئەڵێن (کفت و کەوەرِیٚ) بووم، واتا ماندوو و هیلاك بوومە.

*- **کەولۆس** : یەکیك ددانی پیشەوەی کەتبیٚ.

*- **کەڤەرِیٚ** : بەهەمان مانا دیت، ئەم زاراوەیە لەناوچەی بیتواتەو گوندەکانی بەکاردیت.

*- **کەسمە** : وولاٚخ کەزۆر ماندوو بکریٚ بیتاقەت دەبیٚ، بەتایبەتی کاتی خۆی کە کاروانیان دەکردن، خواردنی نامیٚنیٚ، بەچەند کەسیك وولاٚخەکە لەزەوی دەدەن و ژێر لووتی شەق دەکەن ، ئیسکیکی بچووك بە مووس دەبرِن و ئیدی وولاٚخەکە چاك دەبیتەوە، ئەو ئیسکە ووردە، کەسمەی پیدەلێن.

*- **کەمۆ** : بەمانای مرۆڤی فیڵباز دیت، ئەیان ووت (پیاوەکی کەمۆیە) واتا پیاویکی فیڵبازو زیرەك و زۆرزانە) .

*- **کەند** : شوینیکی چاڵ و قووڵ.

*- **کەندەسۆر** : گوندیکی نوییە لەسەرجادەی گشتی بالیسان.

*- **کتك** : پشیلە.

*- **کشپل** : قشپل، پاشماوەی مەڕوبزن.
*- **کشتەك** : بەواتای قەیتان و بەن دێت، هەروەها بۆمرۆڤی فێڵبازیش دەڵێن فێرە کشتەك.
*- **کەویە بەفر** : پەلە بەفر، شوێنێك لەچیا بەهاران یان هاوینان بەفری لێبمێنێ ، ئەو پارچە بەفرە کەوی پێدەڵێ.
*- **کەڤی** : بەهەمان شێوە دێت، لەهەندێ گوندی سەربەناحیەی بێتواتە کەڤیە بەفری پێدەڵێن.
*- **کلێژ** : سەرکونی سمتی مرۆڤ.
*- **کسکە** : بەزودوونگ وورد دەکرێت و سووردەکرێتەوە.
*- **کلك تەکێنە** : جۆرێکە لە چۆلەکە، بچووکەو لەکاتی نیشتنی کلکی دەتەکێنێ.
*- **کەرکۆخ** : جۆرێکە لەگیای بەهاران، ناوەکەشی لەوەوە هاتووە گەر کەر بیخوا کۆخی دەگاتێ.
*- **کەرەدێ** : زستانان چرۆی ووشك دەدرێ بە بزن و مەڕ، دوای خواردنی چرۆیەکە ئەو چیلکەی دەمێنێتەوە کەرەدێی پێدەڵێن.
*- **کەرەواژی** : چەمانەوە، بەکەسێك دەووترێت کەپیربووبێ و پشتی چەمابێتەوە.
*- **کۆم** : بە دۆڵی بچووك دەووترێت.
*- **کۆرەوەی** باو : جۆرێکە لەمار، ئەو بۆرە مارە گەورەیەیە کەلەسەر رێگاکان خۆی مەلاس دەدات، جووڵەی کەمە، بەلام ژەهری ترسناکە.
*- **کووری** : گیسکی دابەستی، گیسکێك زۆر قەڵەو بێت ئەڵێن دەرێی کووریە!.
*- **کوێژیلە** : کێشکە، چۆلەکە.
*- **کوێریشك** : کەروێشك.
*- **کوڕش** : بۆبانگکردنی وولاخ بەکاردێ.
*- **کێل** بۆوە : واتا هەستایەوە، یەکێك نەخۆش بێت و چاك بووبێتەوە.
*- **کێشکە** : گوندێکە لەنزیك گۆمەسپان.



*- **کیژۆرە** : کیژۆڵە، کچۆڵە.

*- **کۆدەرە** : گوندێکە لە سنووری ناحیەی سکتان.

*- **کۆلکە** رەشە : گوندێکە لەدۆڵی هیران.

*- **کۆز** : پەرژینێکی بچووك لەنزیك مال بۆتێکردنی کارو بەرخ.

*- **کۆراو** : کانیە ئاوێك کە ئاوی کەم بێت، کوێراو.

*- **کۆڕێ**.شارۆچکەیەکە لەسەر رێگای شەقلاوە_پیرمام.

*- **کۆخان** : هەم گوندێکی نوێیە لەبناری هەورێ ، هەم پیاو چاکێکە.

*- **کونەفلوسە** : گوندێکە لەبناری چیای هەورێ، لەسنووری ناحیەی سکتان.

*- کوندەران : جاران کەپرێك لەپێش ماڵ دەکرا بەتایبەتی هاوینان ، کوندەی ئاو دێمکەو لوولکەی ئاویان لەسەردادەنا، کوندەرانیان پێدەگوت.

*- **کۆتك** : قاپ یان جامی لەدار درووستکراو.

*- **کۆترە** : ئەو دارەیە کەدەدرێتە ژێرخانوو .

*- **کوتەك شکاندن** : دوای بەفرکەوتن ئەگەر زۆریکەوێ، زۆربەی رێیەکان دەگیرێن، چەند کەسێك دەچن رێیەکە دەکەنەوە، بەمە دەڵێن کوتەك شکاندن.

*- **کوو**؟ : چۆن؟.

*- **کوچك** : بەرد.

*- **کولك** : وەکوو سۆو قونێر وایە.

*- **کولانکە** : جاران کونێکیان لەسەریان دەکرد بۆدەرچوونی دووکەڵ.

*- **کولافە** : یەکێك زۆر وەڕەس بووبێ ، ئەڵێن (هەندم چاوەڕێ کردی کولافە بووم) بەواتای برینداریش دێت.

*- کراوقاسم : لوتکەیەکی بەرزە لە نزیك چیای هەورێ.

*- **کراوی داوەرێ** : لوتکەیەکە لەسەر زینەتیر.

*- **کراوی دێوانە** : لوتکەیەکە لەچیای ماکۆك.

*- **کردم کڕاندم** : هەرچەندی هەوڵمدا، بۆکارێکی کەنەکرابێ.

*- **کرۆتن** : ووردکردنی شتێك بەددان.

*- **کرۆژتن** : بەهەمان واتا.
*- **کرووك** : گوڵ.
*- **کرێوە** : لەکاتی بەفربارینداً با هەڵبکات و بەفرەکە ببەستێ کرێوەی پێدەڵێن.
*- **کرووك ماست** : بەهاران لەکاتنی زۆربوونی ماست دەڕوێ، چەند رەنگێکی هەیە.
*- **کرووك بووکۆرە** : گوڵێکی بەهاری رەنگ سوورە.
*- **کرووك فەقێ** : گوڵێکی بەهاریە رەنگی مۆرە وەکوو دەمەشێر وایەبەکۆمەڵ دەڕوێن.
*- **کروك عاجیلە** : گوڵێکی سروشتی بەهاریە ، لەزەوی زۆربەرز نابێتەوە، گوڵەکەی ووردەو سپیەو دەورەکەشی زەردە، بۆدەرمانی کوردەواری بەکاری دێنن.
*- **کەربەشە** : جۆرە گیایەکە بەهاران دەڕوێ.
*- **کشتەك** : ئەو داوەی کە وەکوو کەزی دەپەشتری، هەروەها کەسانی فێڵبازیش فێرە کشتەکیان پێدەگوتن، وەئەو کەسانەی کەنەخۆش دەکەوتن و نەخۆشیەکەیان درێژخایەن بوو، دەیانبردە سەر چاکێك، ئەو پەڕۆ سەوزەی لەسەر چاکەکە بوو پارچەیەکیان لێدەکردەوەو لەدەستی نەخۆشەکەیان دەبەست، بەمەشیان دەگووت کشتەك.
*- **کوڕەبەشە** : گیاندارێکی زۆرقەڵەوەو هێندەی پشیلەیەك دەبێت.
*- **کرمۆکە** : خشڵێکی کۆنە، ژنان بەتاسیانەوە دەخست.
*- **کیش** : بەمانای چ ئیشێك دێت، بۆنموونە (کیشەکەی؟) بەمانای چ ئیشێك دەکەی؟.



# گ

* - **گابۆڕە** : کە وولاخێکی بەرزە سەردەبڕێت ، خوێنەکەی بەربلاو دەبێت، گاو جوانەگا دەچنە سەرخوێنەکەو لە بۆڕە بۆڕ دەدەن بەمە دەلێن گابۆڕە.
* - **گابنە** : ئەو گایەی دەکەوێتە نزیك دارچەقی گێرەکردن.
* - **گاپەل** : باڵندەیەکی زۆر جوانەو لە کۆتر گەورەترە.
* - **گاتوو** : شاتوو، تووی سوور ، تووشامی.
* - **گارەگار** : دەنگی مریشکی هێلکە کەر.
* - **گانگێو** : بۆشتی گەورە بەکاردێت، وەکوو ماری گانگێو واتا ماری گەورە.
* - **گاشە** : بەبەردی گەورە دەووترێت.
* - **گاگۆرە** : نەخۆشیەکە تووشی وولاخی بەرزە دەبێت بەتایبەتی مانگا ، وەکوو (زیپکە) وایە لەزمانی مانگا دێت.
* - **گارەدان** : کلیل دان، قفل دان.
* - **گجوولە** : بەبێچووی سەگ دەووترێت.
* - **گرواز** : بەری دارمازووە وەکوو گروان وایە، پرچ لوول.
* - **گرەدۆشاو** : گلێکی سپیە لەدۆشاوی دەکەن .
* - **گڕاو** : گوندێکە کەوتۆتە خوارووی سەری رەش.
* - **گڕك** : دەستاڕی لەدار دروستکراو بۆ لێکردنی برنج بەکاردەهات.
* - **گزرە** : بڕینی داری تەڕ لەچیاو لەسەریەکدانان بۆ پاییز.
* - **گەجەرو** گوجەر : بەکەسانی خوێڕی و سەرسەری دێت، یان ئەو کەسانەی کە کەس حیسابیان بۆناکات.

*- **گەلحۆ** : بەواتای گێل و نەفام و گەمژە دێت.

*- **گەرەوان** : دووگوندن (گەرەوانی سەروو و خواروو) لەنزیك شەقلاوە، هــەروەها بەهەمان شێوە دووگوندن لەرۆژهەلاّتی رواندز.

*- **گەرشك** : ئەو دارەی كەوا دەدرێتە بەر مێو بۆئەوەی خــۆی لەســەر رابگــرێ، لەهەندێ شوێن (تەژە) پێدەلێن.

*- **گەرۆتە** : گوندێكە لەنزیك هیران.

*- **گەولانەوە** : جوولاّنەوە، یەكێك زۆر بەئاستەم بتوانێ خۆی بجوولێنێ.

*- **گەریاوە** : گوندێكە لەخوارووی مەسیف.

*- گرد گۆران : گوندێكە لەسنووری ناحیەی سكتان.

*- **گەنـدەر** : ئەم زاراوەیە بریتیە لە دارێك كەبە ووشــكی ئــاوی مشــتبێ و بــەو هۆیەوە بێوو داس نەیبڕێ ، بەو جۆرە دارە ئەلێن گەندەر.

*- **گوفگە** : ئەو پەتەی كەدەكرێتە ملی (گیسك و بزن و .....هتــد) گوفگــەی پێدەلێن.

*- **گۆرەگۆر** : گرمە گرم و دەنگی هەورە تریشقە.

*- **گوست** : پەنجەی دەست یان پێ.

*- **گۆڕبەشێر** : گوندێكە لەدۆلّی مەلەكان.

*- **گۆڕبەشێر** : گوندێكە سەربەناحیەی سكتان.

*- **گوڕی** : گڵپەی ئاگر، هێزو مەشخەلّی ئاگر.

*- **گۆمەسپان** : یەكەم گوندە لەسنووری دۆلّی قەلاّسنج و دۆلّی سماقولّی.

*- **گواندە** : زبلّدان، گوفەكی زبلّ.

*- **گورگە** : جۆرێكە لەبژارو لــەژێر تەماتــەو تــووتن و چــێنراوەكانی تــردا شــین دەبێ، رەنگی سپی و مۆرە ، چێنراوەكە لاواز دەكات ، بژارێكــە زۆرزیــان بــە چێنراوەكان دەگەیەنێ.



*- **گونە بی** : بەهاران داری بی دوای پشکوتنی گەڵاکانی بەرێك دەردەکات ، ئەم بەرە لێدەکرێتەوەو دەخورێت.

*- **گونك** : ئەوانەی گونیان گەورەیە، فتق.

*- **گوێزتە لێیە** : ئەم زاراوەیە لەهەندی گوندی خۆشناوەتی بەکاردێت، بەتایبەتی پیاوە بەتەمەنەکان بەکاری دێنن و خەریکە لەناو دەچیٚ، بەواتای (حەزت لێیە؟) .

*- **گوزری بەرسینگێ** : جۆرێکە لەیاریە رەسەنەکانی خۆشناوەتی، سینگێکیان دەچەقاند و چەند گوزرێکیان لەژێر سینگەکەدا دادەنا، یەکێك پاسەوانی لە گوزرەکان دەکرد، ئەو گرووپەی دەرەوەی سینگەکەش ئەیان ویست کە گوزرەکان بدزنەوەو بەو گوزرانە لەو کەسەیان دەدایەوە.

*- **گۆنەڵ** : گۆنەل وشەیەکی تری خۆشناوەتیە، لەهەندیٚ گوند بەکاردێت و تائێستاش ماوە، بەزاراوەیەکی رەسەنی خۆشناوەتی دادەنرێت، ماناکەشی ئەوەیەبەو جۆرە پیاوانە ئەووترێت گۆنەڵ کە خڕو تێك چەقیوو و کەمێك قەڵەون، لەهەمان کاتیشدا فێڵبازن، هەندیٚ جاریش وەکوو جنێو بەکاردێت ، لەو کەسە تووڕە ئەبن و پێیدەڵێن (هەی گۆنەڵی ناپەسەند) .

*- **گۆد** : بەواتای دەست و پیٚ سڕبوون بەهۆی بەفر، یان پیٚ تەزین.

*- **گۆردی** : ئەو بزنانەی گوێیەکانیان پان و درێژن.

*- **گۆردی پۆش** : ئەو بزنانەی گوێیان پان و سپین.

*- گۆردی **کار** : ئەو بزنانەی گوێیان پان و مەیلەو قاوەیین.

*- **گۆردی** مس : ئەو بزنانەی کە گوێیان پان و رەنگیان بۆرن.

*- **گۆردی رەش** : ئەو بزنانەی گوێیان پان و رەشن.

*- **گۆرمزە** : گیایەکی بەهاریەو دڕکاویە، دوای کوڵاندن هێلکەی تێکەڵ دەکەن، خواردێکی بەتامە، هەروەها یەکێکە لەو گیایانەی کەبۆ دەرمان بەکاری

دێنن.هەروەها ئەڵێن ئەگەر بەهاران گۆرمزە زۆر بێت ئەوا باران کەم دەبارێ و باران برە.

*- **گۆرین** : بەمانای ئەوە دێت کەکابرایەك قسەیەکی کردبێت ، کەسەکە لەوێ نەبێت و غائیب بێ، ئەڵێن (وەکی کابرای گۆرین گۆتی) .

*- **گێرە** : چەند وولاخێك بەگوریس لەتەنیشت یەکەوە دادەبەستن و دارێك لەناوەڕاستی گیا یان گەنم و جۆ دەچەقێنن و وولاخەکان لەسەر گیایەکە دەسوڕێنن تاکوو ووردی دەکەن.

*- **گیرۆبوون** : گیرۆدەبوون، ئاڵوودەبوون.

*- **گیا پەرچێوە** : جۆرێکە لەو گیایانەی کە پاییزان دەڕوێ و لەگەل تۆرکە تێکەڵی دەکەن بۆ خواردن.

*- **گلێرە** : وەکوو تەزرە وایەو دوای بەفربارین دەبارێ ، لەهەندێ شوێن بەفرخۆرکەی پێدەڵێن، گلێرە بەفر دەتوێنێتەوە.

*- **گێلمە گێلم** : بەیەکێك دەووترێت کە زۆر ووتنی لەلا باش نەبێت، یان بەواتای قسەی بێماناش دەگرێتەوە.

*- **گێل مەندۆخ** : کێشەیەك کەزۆر گەورە بێت و بەکەس چارەسەر نەکرێت ئەڵێن بۆتە گێل مەندۆخ ، واتای فیتنەو ئاشووب.



## ل

*- **لاسك** : قەدی مێو.

*- **لاسە** : گوندێکە لەنزیك شەقلاوە.

*- **لاس** : جۆرە دارێکی دڕکاویە.

*- **لاولاوە** : جگەلەلاولاوەی ئاسایی کەبۆجوانی لەدەوری کەپرو ساباتدا دەچێنن و پاییزان گوڵێکی جوان دەردەکات، لاولاوەیەکی تریش هەیە و جۆرێکە لەبژار لەنێو چێنراوەکاندا دەڕوێ خۆی دەئاڵێنێتە سەر شینایییەکان و لاوازی دەکات.

*- **لاتەلقەوچ** : لەپەنایەکدا.

*- **لاڕەشە** : شێرپەنجە، نەخۆشیەکە تووشی ئاژەڵ دەبێت.

*- **لاییدە** : بەکەسێك دەووترێت کە بێگانە بێت و کەس نەیناسێت.

*- **لەبا** : مێیەی سەگ دێرەکەی پێدەڵێن، ئەو کاتەی کەکاتی پەڕینە، چەند سەگێکی دەکەوێتە دوا، بەو دێرەکەیە دەڵێن لەبا.

*- **لەترقژنیدا** : دەنگی پێکەنینی بەرز، قاقا پێکەنین.

*- **لەپکە شینکە** : بۆچاووزار لەملی منداڵ دەکرا.

*- **لەبەرکردن** : داکەندنی جلوبەرگی لەنێوقەدی مرۆڤ بەسەرەوە وەکوو (کراس، فانیلە، کورتەك، ساقۆ....هتد) .

*- **لەپێکردن** : داکەندنی جلوبەرگی کەلەخوارووی نێوقەد دەپۆشری، وەکوو (شروال، بیجامە، دەرپێ) هەروەها (گۆری و پێڵاو) .

*- **لەق لێدان** : بانگێڕان بەباگوردان جارێك.

*- **لەق لێدان** : وولاخی شەمووس کە بە پێیەکانی پشتەوە لەمرۆڤ بدات.

*- **لەق لێدان** : تێکدانی کارێك کە رێکخرابێ، هەلوەشاندنەوە.

*- **لەم وابێ** : وامزانی، بیرم بۆئەوە چوو.

*- **لەهۆر خۆچوون** : ئاگا لەخۆبڕان، بێهۆش بوون، یەکێك نەخۆش بێ و خەوی لێبکەوێ.

*- **لەمە چێتر** : جنۆکە.

*- **لەندەهۆر** : سەرکردەیەك بووە لەخۆشناوەتی ناوی زۆر لەبابەتی مێژوودێت.

*- **لەندەهۆر** : بەکەسی زۆرخۆر دەووترێت، وەکوو دەڵێن (دەرێی لەندەهۆرە قەت تێرنابێ) یان (هەندی لەندەهۆرەکی خوارد) .

*- **لەتەرەب** : ماین و ماکەر کاتی پەڕین پێیان دەڵێن لەتەرەب.

*- **لەکەر** : چێل (مانگا) کاتی پەڕین پێیان دەڵێن لەکەر.

*- **لیس** : شوێنی حەوانەوەی کەو لە زستان لەژێر تاشەبەردی گەورە.

*- **لیسك** : شوێنی هەڵنیشتنی مریشك بەشەو.

*- **لینگ** : بەو کەسانە دەووترێ کەیەك لاقیان هەیە.

*- **لێداوران** : لەدەور کۆبوونەوە، لەنزیکیەوە کۆبوونەوە.

*- **لێڕەبادان** : واتا قورنچکە لێدان.

*- **لێمشت** : ئاوی زۆر، لافاو.

*- **لیچماو** : کەسێك لەکاتی نانخواردندا پاشماوەی خواردنی بەناو دەستدا شۆڕبێتەوە، یان خەوتبێ لیك لەدەمی بێتە دەرەوە.

*- **لێگێڕانەوە** : بۆئەو کەسانە بەکاردێت کەبەدوایاندا بنێری بۆداوەت و خۆشی.

*- **لۆچە** : ئەو کاتەی گوێزو چەقەلەو باوی لەبەرگەکەی دێننە دەرەوە لۆچەی پێدەڵێن.

*- **لگبن** : خشتی دیوار.



## م

*- **ما** : بۆ؟ لەهەندێ گوندی سەربە بێتواتە بەکاردێ، (ما واکەی؟) بۆ وادەکەی؟.

*- **مات** : کز، لاواز، کڕو بێدەنگ.

*- **ماتە** : خۆکزکردن ، سەرەتای پێگەیشتنی بەرووبووم، (هەنجیر ماتە بووینە) .

*- **ماچماچانێ** : راموسان، یەکتری ماچکردن.

*- **ماخۆ** : خاوەن، ساحێب.

*- **مادۆن** : پێدەچێت ئەم وشەیە لەعەرەبیەوە هاتبێت ، بەواتای پشوو یان وەرگرتنی مۆڵەت دێت، جاران ئەگەر یەکێك سەرباز بوایە و بۆپشوو هاتبایەوە ماڵ ئەیان ووت (مادۆن) ی وەرگرتووە، واتا ئیجازەی وەرگرتووە.

*- **مارکردن** : دروستکردنی ماڵ و جیابوونەوە لەدایك و باوك و خوشك و برا.

*- **ماخەرانەبووی** : واتا مالت خەراب نەبێت، مالّت وێران نەبێت.

*- **مام دەرزی** : جۆرێکە لە گیای بەهاری، وەکوو دەرزی باریکەو لەگەڵ تۆرکەو گیایەکانی تر لێدەنرێ.

*- **ماکۆك** : زنجیرە چیایەکی بەرزە کەوتۆتە باکووری بێتواتە.

*- **مالۆس** : بەرازی مێیە.

*- **مامەجەلکە** : گوندێکە لەسەر رێگای (هەریر_شەقلاوە) .

*- **مامۆتك** : یەکێك زۆر شارەزای ئیش و کاران بێت، بلیمەت.

*- **ماش و برنج** : بریتیە لەتێکەڵ بوونی مووی رەش و سپی سەر، (سەری ماش و برنج بووە.

*- **مانگ** : نەخۆشیەك بوو تووشی منداڵ دەبوولاوازی دەكردو خوارنی كەم دەخوارد.

*- **مەسەبە** : دانانی كەوی ماڵی لەناو شوێنێك بۆراوكردنی كەوی كێوی.

*- **مەگیرانی** : لەمانگی یەكەم و دووەمی زگپڕی ، ژنان دڵیان تێك دەچێ و كەم ئارەزووی خواردن دەكەن ، ئەو ماوەیە حەزوو ئارەزوویان زیاتربۆ خواردنی ترش دەچێ، ئەو حەزە مەگیرانی پێدەڵێن.

*- **مەتكەب** : مەكتەب، خوێندنگا، قوتابخانە.

*- **مەدۆ** : كورتكراوەی ناوی (ئەحمەد) .

*- **مەدەد** : فریام كەوە، داوای یارمەتی كردن لە پیاو چاكان.

*- **مەرازە** : لەوزەتێن، گەروو هەڵستان.

*- **مەرزنجۆش** : گیایەكی بەهاریە بۆ دەرمان دەشێ.

*- **مەرس** : گای بنە لە گێرەدا، عادزبوون، سەرسام بوون.

*- **مەمرەمەژی** : ژیانێك لەنێوان مردن و ژیاندا، ئەوانەی زۆر هەژارن، ئەوانەی زۆر نەخۆشن.

*- **مەعبەین** : لەنێوان، مابەین (لەمەعبەینی زستان و بواردا) .

*- **مەلەكان** : یەكەم گوندی خۆشناوەتیە لەباكوورەوە، ئێستا هاوینە هەوارێكی بەناوبانگە.

*- **مەلۆك** : گوندێكە لەسنووری ناحیەی بێتواتە.

*- **مەشۆكە** : ئەم زاراوەیە زۆر كۆنە و خەریكە لەناو دەچێ، بەو گوێ درێژە (كەرە) ئەڵێن كەزۆر بەتەمەن بووبێ و توانای هەڵگرتنی باری نەبێ ، واتا پیرەكەر.

*- **مەغۆ** : سووككردنی ناوی مەغدید.

*- **مكارە** : ئامێری دار كۆڵین.

*- **مگێز** : حەزوو ئارەزوو.



*- **مس** : بزن و گیسکی بناگویێ دوورەنگ.

*- **مسێ** : بانگکردنی (مسریە) .

*- **مسکی** : واتا شەدە.

*- **مستۆ** : سووککردنی ناوی مستەفا.

*- **مچە** : سووککردنی ناوی مستەفا.

*- **مشەڕەت** : نێردراو بۆدۆزەخ. (بەجهەننەمێیان مشەڕەت کرد) .

*- **مشەمما** : وەکوو خێمە وایەو ئاونادات، جاران بەسەر باری وولاخیان دەپێچا بۆئەوەی تەڕ نەبێت .

*- **مشتاغ** : راستکردنی پارچە زەویەك و پاککردنەوەی بۆئەوەی ترێ ی لێدابنێن بۆووشك بوون بۆئەوەی ببێتە مێوژ، هەروەها بۆ ووشککردنی تووتنیش بەکاردێت.

*- **مغەیری** : ئەم وشەیە لە وشەی (غار) عەرەبیەوە خزاوەتە نێو زمانی کوردیەوە، بەواتای ئەشکەوتی گەورە.

*- **مۆنە** : ڕووگرژو تووڕە.

*- **مۆتە** : بەرزاییەکە لەدۆڵی بالیسان.

*- **مۆدنە** : بڕینی قەدەکانی داربەڕوو، بۆئەوەی دارەکە زۆر گەورە نەبێت و زوو پیر ببێت.

*- **میراوە** : گوندێکی نزیك شەقڵاوەیە.

*- **مێدڕەوە** : محەجەرەی لێواری سەربان.

*- **میل** : ڕاوچیەکان هەندێ بەرد لەسەریەکدا دەنێن، بۆخۆحەشاردان، هەندێ چرۆو گەڵا لەدەوری خۆیاندادەنێن بۆ ڕاو کردن.

*- **میرووسی** : یەکێك لەگەڕەکەکانی بالیسانە ، یەکێك لەکوڕەکانی (ئەمبیز بووە) لە میریوسفەوە خزاوە بۆ میرووسی.

*- **مێنەك** : جاران خەڵكی خۆشـناوەتی كاروانیـان دەكـرد بـۆ دەشـتی هـەولێرو شوێنەكانی تر، وولاخەكان هەموویان باری تایبەتیان لێباردەكرا، كەرێكیشـیان دەبرد پێداویستسەكانی وەكوو خواردن و كەلوپەلی نووستنیان لێباردەكرد، بەو گویَ درێژەیان دەگوت مێنەك.

*- **مێرگەسەر** : گوندێكە لەسەر رێگای (بالیسان_بێتواتە) .

*- **مرداو** : ئاوێكی كەم، كانیەك ئاوی كەمی لەبەر برِوا.

*- **مردۆخ** : لەرِو لاواز ، سیس و بێتوانا، پیاوی نابووت، حیزە پیاو.

*- **مریشكاویلكە** : باڵندەیەكی مل درێژەو لەنزیك گۆماوەكـان ووردەماسـی راو دەكات.

*- **مریشكە رەشە** : گەیشتن بە مەبەست، تێگەیشتن و گەیشتن بە بنج و بنـاوانی مەبەستێك.

*- **مریَ** : بانگكردنی (مریەم)

*- **مریلە** : مەریەمی گچكەی ژیكەلە.

*- **مرۆكە** : مەریەمی بەستەزمانی ماڵوێران.

*- **مرخ لێخۆشكردن** : حەزلێبوون، تەماعی تێوەكردن.

*- **مرخێش مرخێش** : هەناسە تەنگی هەناسە سواری ، یـەكێك بـارێكی قورِسـی هەڵگرتبیَ.

*- **مرقاندن** : دەنگ لێوەهاتنی نێری لەكاتی جووت بوونی لەگەڵ بزن.

*- **مرووت** : خولق، بێتوانا ، ناپیاو.

*- **مرۆ** : مرۆڤ، بنیادەم ، ئینسان ، پیاو.

*- **مزاش** : لەجیاتی پارە برِێك گەنم دەدریَ بە ئاشەوان.

*- **منەمن** : یەكێك قسە بكات و كەس تێینەگات.واتا قسەی بن لێوان.

*- **منیَ** : منەت، حەزكردن، یەكێك كارێكی بەدڵ بیَ .خۆزگـە خواسـتن، (منـیَ كەم بێمەلات) (منیَ كەم ببینم) .

# ن

*- **نابووتی** : یەکێك دەوڵەمەند بێت و هەژاری رووی لێبنێ، یـان یـەکێك بـاری دارایی باش نەبێ.

*- **ناجسن** : نارەسەن.

*- **نازەنین** : گوندێکی بەناوبانگە لەدۆڵی هیران.

*- **ناودۆك** : ئەو دوو دارەی کەلەسەر مەشکە بەستراوە.

*- **ناورانەوە** : یەکێك زۆر بەئازار بێ، یەکێك زۆر باسی نەبوونی خۆی بکات.

*- **نـاوکردن** : بەناوبانگ بوون، یـەکێك لـەپیاوەتی دەسـتبڕۆیی و خزمـەتکردنی خەڵك ناوی دەربکات.

*- **ناوگۆڕك** : ئاگردانی دیوەخان و مزگەوت.

*- **ناودارۆکان** : گوندێکە لەبناری سەفین، لەسەرەتای دۆڵی سماقوڵی.

*- **نان دین** : ئەو شوێنەی نانی تیادا ئامادەکرێ، یان نانی لێدەکرێ.

*- **نان و زگ** : کارکردن بەبێ کرێ ، تەنها بۆ نان خواردن.

*- **ناشکور** : سپڵەو پێنەزان، بێئەمەك.

*- **ناسکە** نان : ئەو کولێرەیەی کەبەرۆنی ئاژەڵ دەکرێ.لەسەر ساج دەیبرژێنن.

*- **ناقایل** : نارازی.

*- **ناقۆرا** : یەکێك زۆر خۆی بە گەورە بزانێ.

*- **ناگوزوری** : هەژاری، ماڵ وێرانی، دەست تەنگی.

*- **نارەنار** : ناڵەناڵ، یەکێك نەخۆش بێت و هاوارهاواربکات.

*- **ناوپیستێر** : ئەو بەشەی شلوار یان پانتۆڕ کەدەکەوێتە نێوان هەردوو لاقی مرۆڤ.

*- ناوو ناتۆر : ناوی نارەوا لەخەڵك نان، یەکێك نازناوی خراپی بۆ دابنێن.

*- **ناوبرێشك** : ئەو دارە پانەی کەنانی لەسەر ساج پێوەردەگێڕن.

*- **نوردیەنان** : نان دوای کردن پارچاندنەوەی لەسەر یەك.

*- **نۆین** : ئاوەڕۆ،

*- **نسێ** : سێبەر.سایە.

*- **نسیبەت** : کارەسات ، موسیبەت.

*- **نشێو** : لێژ، سەربەرەژێر.

*- **نقەنق** : کەسێك بارێکی زۆری لەسەرشان بێت و دەنگێکی لێوەدێت.

*- **نەقوستان** : کەم ئەندام.

*- **نمەك** : بریتیە لەخواردنی شتێك لەماڵی کەسێك .

*- نمەك کردن : خواردنی نانی کەسێك.

*- **نمەك گیر** : تووشی بەڵاهاتن لەسزای بێنەمەکی و سپڵەییدا.

*- **نمەك حەرام** : سپڵە، بێ ئەمەك.

*- **نیمدەر** : رایەخێکی گچکە.

*- **نیرگە** : ئەو دارە گەورەیەی لەخانووی دادەنێن کە دارەکانی تری دەچنە سەر.

*- **نێوە** : گوندێکە لەسنووری بێتواتە.

*- **نووسەك** : چیایەکە لە سنووری بێتواتە.

*- **نواوە** : گوندێکە سەربەناحیەی بێتواتە.

*- **نوانەوە** : خوسانەوە.

*- **نوزەنوز** : گریانی منداڵ بەشێوەیەك کەماوەیەکی زۆر بخایەنێ.

*- **نۆبەرە** : یەکەم منداڵی خێزان.



*- **نۆشی گیانت بێ** : کەسێك کە ئاو دەخواتەوە بەرانبەرەکەی پێیدەڵێت ، واتا عافیەتت بێت.

*- **نووساندن** : لکاندن.

*- **نووکە** نوك : گریانی بە ناڵاندنەوە، گریانێکی بەدەنگ.

*- **نەبادا** : نەوەکوو.

*- **نەبان** : ئەو ئاژەڵانەی کە بێچووی خۆیان ناوێ و نایەڵن شیریان بخۆن.

*- **نەدیتە** : کڕین و فرۆشتن بەبێ ئەوەی کاڵاکە ببینرێ.

*- **نەدیتکۆکە** : دنیا نەدیتە، نەشارەزا، نەدیوبدی.

*- **نەڕنایش** : دێڵەدێو، ژنی باڵابەرزی نەقۆڵا.

*- **نەزۆك** : ئەو مێینانەی کە بێچوویان نابێ.

*- **نەمرونەژی** : کەسێك زۆر نەخۆش بێت، لەنێوان ژیان و مردندا، هەژاری.

*- **نەوێرۆك** : زۆر ترسەنۆك.

*- **نەوەکینێ** : مەبادا، نەوەکوو.

*- **نەوەکوونێ** : نەوەکوو ، مەبادا.

# هـ

*- **هارێکـە** : بۆدەستخۆشـیکردن بـەکاردێت، ئەگەریـەکێك کـارێکی کەسـی بەرانبەری بەدڵ بوو، ئەوا دەڵێ هارێکە، واتا دەستت خۆش بێت.

*- **هەرزارە** : کەپرێکە بۆئەوە دروست دەکرێ تاکوو تووتنی لەسەردا بنێن تـاکوو ووشك دەبێت، لەهەندێ شوێنیش کەپری مێو هەرزارەی پێدەڵێن.

*- **هەرمیشك** : تێکەڵکردنی ووردکە نان لەگەڵ دۆشاو.

*- **هەرتەل** : گوندێکی گەورەیە لەسنووری ناحیەی بێتواتە.

*- **هەراخنین** : پڕکردنی گوش یان گونیە لە شت.

*- **هەرمك** : گوندێکە لە سنووری ناحیەی بێتواتە.

*- **هـەترەقان** : نزایەکە دایك بۆمنداڵەکەی دەکات، وەکوو (وەی هەترەقێم لۆتوو کورم) ، بەواتای لەپاڵ یەك هەڵوەشانەوە، پارچەپارچەبوون.

*- **هەرووتی** : عەشیرەتێکن لەسنووری ناحیەی خەلیفان.

*- **هەزوا** : دەرمانی تایبەتی منداڵێنە، بەتایبەتی منداڵی ساوا کـەزۆربگرییێ ، ئەو دەرمانەیان دەدایێ بەو دەرمانە ژیر دەبووەوە، لەچەند رووەکێـك دروسـت دەکرا.

*- **هەنیە** : نێوچەوان ، بەخت.

*- **هەنیشك** : ئانیشك.

*- **هەندرێشە** : گیایـەکی بەهاریـەو لـە کوێسـتانەکان دەڕوێ، لەگـەڵ خـواردن وەکوو سەوزە دایدەنێن.

*- **هەنگینێ** : بەواتای ئەو کاتی، (کەهاتیەوە هەنگینێ دێم) واتا ئەو کاتی دێم.
*- **هەوك** : بەواتای گەروو و قورگ دێت.
*- **هەورێ** : چیایەکی گەورەو دوورو درێژە ، دۆڵی بالیسان و دۆڵی هیران لەیەك جیادەکاتەوە.
*- **هەوگیان** : خێزانی برای مێرد.
*- **هەمێ** : کورتکراوەی ناوی هەمین.
*- **هەوی** : مانگ.
*- **هەنارە** : گوندێکە لەنزیك بەستۆرە.
*- **هەندیگایێ** : هەرئێستا، هەرلەو کاتە.
*- **هەنووکە** : هەرئێستا، هەرئەلعان.
*- **هەپەی لێنا** : ئەم وشەیە زۆر رەسەنەو تائێستاش زۆر بەکاردێت، ئەگەر یەکێك بیەوێت شتێك بفرۆشێ و کڕیاریش مەبەستی لێبی و بەهەرزان شتەکەی لەبن دەستان بێنیتە دەرێ، ئەوا ئەڵێن هەپەی لێنا واتا قۆڵی بڕی و فرتوفێڵی لێکرد.
*- **هەڕمان** : یەکێك خەوی لێنەکەوێت و خەوی بزڕێ ، ئەڵێ ئەو شەو خەوم لێهەڕماو خەوم لێنەکەوت.
*- **هوردە** مار : بریتیە لە چەند سەرەبزنێك ، لەگەڵ مێگەڵ دەکرێ.
*- **هوولە** : ئەگەر ماڵێك منداڵیان زۆر بێت پێیدەڵێن هوولە.
*- **هوورگ** : واتا زگ ، وورگ.
*- **هۆدە** : ژوور.
*- **هۆر** : هۆڵی داکردنی مەڕوو ماڵات.
*- **هوورگن** : منداڵێك وورگی زۆرگەورە بێت ، لەحەددی خۆی زیاتر.
*- **هوڕی** : بۆگێڕانەوەی ئێستر و وولاخ بەکاردێت.





*- **هێدمە** : سەیرکردنی شتێك بەسەرنجێکی زۆرەوە .

*- **هیرتە** : هێرەنگ.

*- **هەرکەو** : ئەم زاراوەیە ئێستاش لە خۆشناوەتی بەکاردێت، ئەو تاشە بەردانەن کەوا ئاویان لەسەر رادەوەستێ ، بەهاران ئاوی لەناو کۆدەبێتەوە، راوچیەکان و دارکەرو رێبوارو شوان و کارەوان و گاوان ئاوی لێ دەخۆنەوە، بەڵام ئاوی لەبەر ناڕواو هەمیشە راوەستاوە ، بۆیە زوو پیس دەبێت، پەلەوەرو گیانداره کێویەکان ئاوی لێدەخۆنەوە، هەرکەو دووجۆری هەیە ، هەیە سرووشتیە ، هەشە دەستکردە، لەچیاکانی خۆشناوەتی چەندان نمونەمان هەیە.

*- **هەرووبوون** : تووڕەبوون یان تۆران.

*- **هەربرێنگاندن** : کاتێك کەباران یان بەفر زۆر دەبارێ، پاشان هەور کەمێك بەرز دەبێتەوەو بارانی لێنایی.

*- **هەرپەساردن** : هەڵپەساردن، یان هەڵواسین.

*- **هەرێز** : جۆرە دارێکی کێوی دڕکاویە، زۆر دەگمەنە.

*- **هەڕمێن** : کاڵایەك بازاڕی هەبێت و زوو بفرۆشرێ.

*- **هەلادی** : جارەکەی تر، ئەویجارێ.

*- **هەربەخۆینە** : واتا کەسی بێگانەمان لەلانیەو هەرخۆمانین.

*- **هششە** وۆش : بۆراگرتنی کەرو ئێستر بەکاردێت .

*- **هێششە** : بۆگێڕانەوەی بزن و مەڕبەکاردێت.

*- **هیران** : سەنتەری ناحیەی خۆشناوە، لەرۆژهەڵاتی شەقڵاوە.

*- **هیزۆپ** : گوندێکە لەکۆتایی ناحیەی سکتان.



## و

*- **واك** : هەرامە، هێن.

*- **وانەك** : هەرامە ، هێن.

*- **وارێم** : دەڵێم.

*- **وارێن** : ئەڵێن.

*- **وارکۆر** : کەسێك هیچ منداڵی لەدوای مردن بەجێ نەمێنێ.

*- واقەواق : دەنگی ناڵاندنی رێوی و توورگ.

*- **وایلێ** : هەی دادو و هەی هاوار.

*- **وەیمرێمێ** : پێیدەڵێم.

*- **وەمگۆتێ** : پێم گووت.

*- **وەیانەرێمێ** : پێیان دەڵێم.

*- **وەی گۆ** : وای ووت، ووتی.

*- **وێیانەگۆ** : ئەیان گووت.

*- **وێڕاگەییە؟** : پێگەیشتووە، یەکێك چاوەڕێی خواردنە و دەپرسێ، وێڕاگەییە؟.

*- **وێم دەوە** : بدەوە.

*- **وێدە** : بیدەرێ.

*- **وێداوە** : دایەوە.

*- **وێیانداوە** : دایانەوە.

*- **وێرەڕاچوو** : بێرەدا رۆیشت.

*- **وێراهێ داچوو** : بۆ شوێنێکی دوور بەکاردێت.

*- **واریٚ ی چ** : چی دەڵێی.

*- **وەیانەگۆ** : ئەیان ووت .

*- **وەباهاتن** : کاتیٚ کە دێڵەسەگ مەیلی جووت بوونی دەبێت لەگەڵ سەگ.

*- **وەبن دانەوە** : برینێك دوای چاك بوونەوە سەرلەنویٚ سەرهەڵداتەوە.

*- **وەتر** : لەوە زیاتر، واتر.

*- **وەبرم دیتۆ** : بیرم دێتەوە.

*- **وەبیرت نایێتۆ** : بەبیرت نایێ؟.

*- **وەبنیداوە** : سەری هەڵداوە، دەستی پێکردەوە.

*- **وەجاغ کۆر** : یەکێك منداڵی نێرینەی نەبیٚ.

*- **ودم** : پیرۆزی، ئیجازەی شێخێك کەبە یەکێکی تری بدات ، کەتف و فووی دەرمان بیٚ، هەروەها ماربگریٚ.

*- **وشی** : هێشووە تریٚ.

*- **وەغەر** : سەفەرکردن یان رۆیشتن.

*- **وەسواس** : دوودڵی لەکردنی شتێك، یان ئەوانەی زۆر پێدادەگرن لە خەرجکردنی ئاو، وادەزانن کەلوپەلەکەیان پاك نەبۆتەوە.

*- **وەسمان** : کورتکراوەی عوسمان.

*- **وەتمان** : کورتکراوەی عوسمان.

*- **وەحە** : وەهە ، ووتەی گاو چێل و مانگا لێخوڕین.

*- **وەختابوو** : زۆری نەمابوو، نزیك بوو، ئەوەندەی نەمابوو.

*- **وەخۆکەتن** : خۆئامادەکردن.

*- **وەرسوڕاندن** : وەرچەرخاندن، سوڕاندنەوەی شتێك بۆبینین.

*- **وەرەنگازی** : نەخۆش و تادارو دڵ بریندار.

*- **ولفەت** : هۆگری بوون، خووپێوەگرتن.

*- **وەمکەوە** : بمکەوە، ئازادم کە.



*- **وەنا** : وەنیە؟ئەدی وانیە؟

*- **وەیلان** : سەرگەردان و بێچارەبوون.

*- **وەیلێ** : وەیرۆ، مخابن.

*- **وەیلۆ** : ووتەیەکە بۆ خۆشەویستی بەرانبەر منداڵ دەووترێت.

*- **وەیلۆلۆ** : ووتەی سەرەتای لاوك.

*- **وەی لێ لێ** : سەرەتای لاوك دەووترێت.

*- **وەشان** : باران بڕان.

*- **وەرێ** : گوندێکە لەسنووری ناحیەی بێتواتە.

*- **وەرگێڕۆك** : ئەگەر ژنێك لەماڵەوە ئیش و کاری پێدەرنەچێ ، مێردەکەی پێیدەڵێ وەرگێڕۆکەیەکت بۆپەیدا بکەم ، واتا ژنێکی بەسەر بهێنی، هەندێ جاریش کچی گچکە وەرگێڕۆکەی پێدەڵێن، لێرەدا بەهاوکاری ماڵ دێت.

*- **ونکە** : گوندێکە لەدۆڵی عەلیاوە.

*- **وسکت** : لەعەرەبیەوە وەرگیراوە بەڵام تام و بۆنی کوردەواریشی پێوەدیارە، بەواتای بێدەنگ!.

*- **وسکت** بوون : بێدەنگ بوون.

*- **وسو** : کورتکراوەی یوسف.

*- **وراغ** : ووڵاخ.

*- **ورسات** : کەسێك کە چێڵ و مانگای زۆر بێ ئەڵێن خاوەن ورساتە.

## ی

*- **یالەیلی** : ئەم زاراوەیە تایبەتە بە خۆشناوەتی زۆر کۆن و رەسەنە، بەو کچانە ووتراوە کە هەمیشە بۆنی خۆشیان لەخۆداوەو بێدڵی خۆیان نەکردووە.

*- **یامنە** : لەهەندێ گوند بەکاردێت بەواتای هی منە.

*- **یاغر** : هێواش، لەسەرخۆ، وەکوو (یاغریاغر ئەڕۆیشتم)

*- **یخخە** : بۆئاژۆتن و وەدەرنانی بزن بەکاردێت.

*- **یەختە** : ئەسپێك کەبۆبارکردن بەکاربێت، نەك بۆ سواری.

*- **یەك تەن** : یەکێك لەماڵەوە تەنیابێت و کەس نەبێ هاوکاری بکات.

بۆ نووسینی ئەم کتێبە سوودم لەو سەرچاوانە بینیوە :

١- فەرهەنگی (هەمبانە بۆرینە) مامۆستا هەژار.چاپی سرووش.

٢- فەرهەنگی (مەلیخا) ئومێد شێرکۆ شاکرمەجروم.بەرگی یەکەم، چاپخانەی شەهاب هەولێر، ٢٠١٠.

٣- بڵاوکراوەی (ئاوێر) کەلەبالیسان دەردەچوو ٣٣ ژمارەی لێدەرچوو.

٤- دەستنووسێکی رەحمەتی (یوسف شەریف) .

٥- بەرێز د.کەریم هەرتەلی کەچەند جارێك لە (ئاوێردا) زاراوەی خۆشناوەتی نووسیوە.

٦- دایکم (حەلیمە شێخ کەمال سەرانی) .

٧- کاك فەقێ شێخ وەسانی.

٨- جێگر شێخ وەسانی.

## ناوەرۆك